رۆمان





# لە ئامێزم بگرە

رێواس ئەحمەد

چاپی دووەم

هەولێر - ٢٠١١

## له ئامێزم بگره!

### سنوور

زۆرن ئەو ژنانەی خۆشم ویستن، زۆرن ئەو ژنانەی ئامێزی دڵیان بۆ کردمەوە. لەگەڵیاندا گریام و پێکەنیم، لەگەڵیاندا رێگای ناو بیابانمان بەرەو سەرابی خەون گرتە بەر. ئەوانە ژنانێکی دانسقە بوون، هەر جارەی یەکێک لەوانە ئەفسانەی خۆیانیان بۆ دەگێڕامەوە. منیش دانە بە دانەی ئەو ئەفسانانەم دەهۆنییەوە و دەمکردنە ملوانکەی گەردنم.

ئەوانە ژنانێکی چاونەترس و سنوورشکێن بوون. من لەوان ناکەم. من بەستراومەتەوە بە سنوور و دابونەریت و دایەگەورەم. دایەگەورەم زۆر دەمێکە کۆچیدوایی کردووە، کەچی ئامۆژگارییەکانی بەردەوام

له گوێمدا دەزرنگێنەوە. خۆ من ناڵێم هەموو ئەو شتانەی ئەو فێری کردم هەڵەن بەڵام هەندێ جار هەڵە و ڕاستییەکانم لێ تێکەڵ دەبێت. یەکێ لە ژنە هاوڕێکانم وتی: «خوشکم ئەوەی دوێنێ ڕاست بوو، لەوانەیە ئەمڕۆ هەڵە بێت. پێوەری ڕاست و هەڵە پێوەرێکی نەگۆڕ نییە. تکات لێ دەکەم ژیان لە خۆت قورس مەکە. یاساکانی ئەم گەردوونە بێسنوورن، ئێمەش بەشێکین لە گەردوون، هەر کاتێ سنوورمان بۆ ژیان دانا ئەوا ژیانمان دەخەینە ناو بازنەیەکەوە و لە گەردوون جیا دەبینەوە.»ئەو ڕاستی دەکرد سەرەنجام منی سنووردار، نابەختەوەرم و ئەوانی بێسنووری تێکەڵ بە وزەی گەردوون، بەختەوەرن. ئەوان توانییان تەنیاباڵ بەرەو هەتاو بڕۆن و ئاسمانیش ئامێزی بۆ کردنەوە و تێکەڵ بە گەرمای تیشکی خۆر بوون.

یەکێ لەو ژنانە پێی وتم «خۆشەویستی و سنوور دوو فاکتەری دژ بەیەکن، خۆشەویستی وەک تیشکی خۆر وایە کە هەڵهات هەموو کون و قوژبنێکی جەستەت دەگرێتەوە، ناتوانی خۆت لەو تیشکە ژیانبەخشە بدزیتەوە. گەر دەتەوێت ژیانت بەردەوام وەک ئەستێرە بدرەوشێتەوە، دەبێت سنوورەکان بسڕیتەوە. گەر خۆشت ببەستیتەوە بە سنوورەکانەوە ئەوا چاوەڕوانی ئەوە مەکە لەم ژیانەدا ئەو کەسە بدۆزیتەوە کە ئامێزی دەبێتە خۆر و ئارامگات. ئەم قسەیە خستمیە ناو گێژاوێکەوە هەتا نووسینی ئەم چەند دێڕە نەمتوانیوە لێی دەرچم. بیرم لەوە دەکردەوە ئەو شوێنە کوێیە وا من تێیدا هەست بە ئارامی دەکەم. دەبینن من سەرگەردانی ئەو جێگەیەم کە تا ئێستا نازانم کەوتووەتە چ وڵاتێکی ئەم جیهانە پانوبەرینەوە. هەرچەندە من دەمێکە بڕیارم داوە باوەشی ژیان تەنیا ئارامگەی من بێت. لە هەندێ ساتی تەواو ئارامدا هەست بە نیگەرانی دەکەم و بەدوای وێستگایەکی تردا دەگەڕێم تا

هەموو خانەکانی جەستەم جەنجاڵ بکات. هەندێ جاریش دەگەییمە ئەو رایەی کە ئامانجی من لەم ژیانەدا گەیشتن بە ئارامی دەروون نییە، بەڵکوو تاقیکردنەوەی ئەو ڕێگایانەیە وا نازانم بەرەو کوێم دەبات. هەر بۆیە لەو شوێنانەی ئارامی تێدا دەدۆزمەوە کۆچی بێهودەیی دەکەم. ئێستا زانیتان بۆچ من سەرگەردانم.

بەردەوام جانتاکەم بە شانمەوەیە، کە دەگەییمە لووتکە، خێرا خل دەبمەوە بۆ دامێنی چیاکە. چی بکەم وا فێریان کردم نە لووتکە ئارامگای من بێت و نە ئامێزێ. سەیر لەوەدایە، من دەمەوێت ژیانی ئەمجارەم لە وێنەی نەبێت. من دەمەوێت ئەمجارە زۆربەی ڕێگاکان تاقی بکەمەوە. من دەمەوێ ئەو ئەزموونانەی لەم ژیانەدا فێریان دەبم لە هەستی خۆمدا بیانپارێزم بۆ ژیانی داهاتووم. چونکە من ژنێکی سەرەڕۆم و جیوەئاسا هیچ شوێنێ بە ماڵی خۆم نازانم. ئەم ژیانەی ئێستام ڕۆمانێکی نیوەچڵە؛ هەروەک ڕۆمانی «ژن».

پێش چەند ساڵێ ڕۆمانی «ژن»مان خوێندەوە، هەموو هەستمان کرد، ئەم ڕۆمانە تەواو نەبووە. بەدوای نووسەری ڕۆمانەکەدا گەڕاین تا بزانین تەواوکەری هەیە یام نا. ئەویش لە وەڵامدا وتی: «تەواوکەری ڕۆمانەکە لای ئێوەیە.» منیش لەو کاتەوە کە زیاتر لە حەوت ساڵە بەدوای ئەو کەسانەدا دەگەڕێم تا بزانم پاش ئەم حەوت ساڵە چییان بەسەردا هاتووە. جگە لە دەریا هەموویانم دۆزییەوە. خۆ دەزانن مردنی دایکیشی دیزە بە دەرخۆنە کرا. من دڵنیام بە هیواکەی خۆم دەگەییم، لەو باوەڕەدا بن ئیرادەی مرۆڤ هێندە بەهێزە دەتوانێ ئەوەی بیەوێ بەدەستی بهێنێ، بەو مەرجەی کۆڵ نەدات. ئەمرۆ لە باخچەی ئەو قوتابخانەیەی لە تەنیشت ماڵەکەمانەوەیە منداڵێکی

شەش ساڵانم بینی، هەوڵی دەدا بەسەر دارێکدا سەرکەوێ، هەموو جارێ دەخلیسکایە خوارەوە. منیش لە پەنجەرەیماڵەکەمەوە سەیرم دەکرد، لەبەرخۆمەوە دەمگوت ئەوە گەورەساڵانێک لەو ناوە نییە تا یارمەتییەکی بدات. دواجار بینم سەرکەوتە سەر دارەکە و لە خۆشیدا هەردوو دەستی بەرزکردەوە. ئا لەو ساتەدا تێگەییشتم مانای کۆڵنەدان و ملنەدان چییە. ئامۆژگاریم بۆ ئێوە ئەوەیە: بۆ گەیشتن بە ئامانج، بەو کەسەی خۆشتان دەوێ، بۆ ئۆقرەگرتن و گەییشتن بە لووتکە مل نەدەن، ماندوو مەبن، سنوورەکان ببڕن، کۆتەکان بپچڕێنن، بەسەر پردە ڕووخاوەکاندا باز بدەن، بەردەوام نیگاتان لە ڕووناکی بێت. ئەو کات دەگەیێنە ئەو ئاواتەی کە هێز و تواناتان پێ دەبەخشێ. بۆ نموونە گەر لە دڵەوە کەسێکتان خۆش ویست و ڕێگای گەییشتن بەو کەسە پڕ لە هەورازونشێو بوو، ئەوا واز مەهێنن و ترپەی دڵتان لەگەڵ هەنگاوەکانی بادا تێکەڵ بکەن و هەناسەتان بدەن بە دەست لەنجەی دارەکانەوە. کە گەییشتنە ئەو کەسە و خۆتان فڕێ دایە ئامێزیەوە ئەو کات دەزانن ئەو ڕەنجەی داوتانە بەفیڕۆ نەچووە و قسەکەی منیش ڕاستە. لەو باوەڕەدابن گەیشتن بە لووتکەی شاخی هیمالایایش کارێکی مەحاڵ نییە، تەنیا مەهێڵن ترس، هەنگاوە گورجوگۆڵەکانتان خاو بکاتەوە. تەنانەت چەند جاریش خل ببنە خوارەوە، هەر دەتوانن سەرکەونە سەرەوەو لە باوەشی ئامانجدا خەو بتانباتەوە.

بڕوا بکەن ئەم ئامۆژگارییەم وەک ئامۆژگارییەکەی دایەگەورەم نییە. لەوانەیە بڕوام پێ نەکەن. گلەییتان لێ ناکەم. چونکە پێشتر نەک تەنیا بێئەزموون بووم، من کەسێکی هەوڵنەدەربووم. هەردەم بەرامبەر ویستەکانی خۆم دەستەپاچە دەبووم. هەر کاتێ شتێکم خواستووە، ئەوا خستوومەتە بەر تیشکی لێکدانەوە. گەر تۆزقاڵێ زیانی مێروولەیەکی

تێدا بووبێت، ئەوا وازم لەو ویستە ویستراوەی خۆم هێناوە. من هەرگیز نەمتوانی لە مەنتقی ژیان بگەم. من نەمتوانی لە (ینگ و یانگ)ەکە تێبگەم. ڕەش و سپی، شەو و ڕۆژ، سوود و زیان... . ئیتر چی بکەم، هەر ئەوەندە لە ژیان گەیشتبووم. نەمدەویست زیانم بۆ حەزی یەکێکی تر هەبێت. بۆیە زۆر زوو خۆمم دەدا بەدەستەوە. ئێوە هەرگیز وەک من مەکەن. گەر وا بکەن بەردەوام ژان دەتانگرێ و چاوەڕوانی منداڵێک دەکەن کە هەرگیز لە دایک نابێت. ئەوانەی منداڵیان نەبووە نازانن ژانی منداڵبوون چ ئازارێکی وەسفنەکراوە. تکایە وەک من مەکەن. من تازە دەمەوێ پەند لە هەڵەکانی ژیانم وەربگرم و سەرلەنوێ دەست پێ بکەمەوە. بەڵام هێشتا خاڵی دەست پێ کردنم دیاری نەکردووە. ئێوەیش با وەک (هەتاو)ەکەی ڕۆمانی «ژن»تان لێ نەیێت. کەسمان شایانی ئەوە نییە بە دەم ئازارەوە خەو بیباتەوە و شەوانیش خەو بە ڕۆژێکی نادیارەوە ببینێت.

کەسەکانی ڕۆمانی «ژن»تان لە بیرە؟ «هەتاو، شیرین، هانس، دەریا، ڕێزان و شارای جوانەمەرگ.»هەموویانم دۆزییەوە، تەنیا دەریا نەبێت. کەسایەتییەکەی دەریا منی ڕاچڵەکاند. دەتوانم بڵێم لەو کاتەوەی من دەریام ناسی ژیانم بەرەو گۆڕان دەڕوات. نیشانەی پرسیار لەبەردەم هەموو ڕستەیەکدا دادەنێم، هەر ئەو نیشانە بەردەوام لەبەردەم خۆمدا قیت دەبێتەوە. هەر ئەمەیش وای کرد لە ژیان ڕابمێنم و بە چاوێکی ترەوە تەماشای هەموو وشەیەکی بیستراو و وێنەیەکی بینراو بکەم. بۆ تەواوکردنی ئەم گەشتە دەبێت دەریا بدۆزمەوە، بەڵکوو تین و تیشکم پێ ببەخشێ و فێری هەوڵدانم بکات، فێری کۆڵنەدانم بکات بۆ گەییشتن بە ئامێزی لووتکەی ئارامی. من دەریام زۆر خۆش ویست. وەک منداڵێکی فرێنراوی خۆم دڵم بۆی ژان دەکات. من دەریام زۆر

خۆش ویست، وەک پارچەیەک لە خۆم. ئێستایش هەر دەبێت دەریا بدۆزمەوە و لە نهێنی کاریگەرییەکەی ئەو لەسەر خۆم بگەم.

دەریا ئەو دەریایەیە وا خۆم دەدەم بە دەم شەپۆلەکانیەوە. دەریا ئەو دەریایەیە کە دەتوانم لە نیگایدا خۆشەویستی بدۆزمەوە و ئیلهامی گەشیم پێ ببەخشێ. دەریا دەمگرییێنێ و پێمدەکەنێنێ. دەریا بۆ من ئاوازێکە و تا مردن و بێ ماندووبوون سەمای لەگەڵ دەکەم. دەریا بۆ من گۆرانییەکی کۆتایی نەهاتووە. بۆیە داوا لە هەمووتان دەکەم یارمەتیم بدەن مانای ئەو سیمبۆڵە بدۆزمەوە.

# - 1 -

هەتاو ماوەی مانگێکە لە کۆمادایە، کەسیش نازانێ هۆشی دێتەوە سەرخۆی یان نا. هانسی کوڕی کە ئێستا تەمەنی حەوت ساڵانە لەگەڵ هاوڕێیەکی نزیکی دایکیدا، ڕۆژانە سەردانی هەتاو دەکەن. هانس منداڵیکە، سەرنج و هۆشی هەموو کەسێ بە لای خۆیدا ڕادەکێشێ. لە هەڵسووکەوتیدا لە منداڵ ناچێ و شێوەیشی فریشتەییە. چەند لە چاوانی ڕابمێنی نازانی ڕەنگەکەی چۆنە، تێکەڵەیەک لە ڕەنگی سەوزی بەهارانەی چاوانی دایکی و شینی ئاسمانی چاوانی باوکی. ڕەنگی پێستی ئەسمەرێکی کاڵە و قژەکەی قاوەییەکی هەنگوینییە. دەڵێن دایکی کە سکی بەمەوە پڕبووە لە هەنگوین زیاتر هیچی نەخواردووە، بۆیە قژی هەنگوینی دەرچووە. لووتە قنجەکەی هەر لە لووتی نەنکی دەکات. لێوەکانیشی ئەستوورە و هەر تەواو لە لێوە نوقڵییەکەی دایکی دەکات. هانس ناتوانێ لە خۆی ببوورێ، چونکە گەر هەڵاتنەکەی ئەم نەبووایە، هەرگیز دایکی نەدەکەوتە ئەم بارەی ئێستاوە، نەورۆز دڵخۆشی دەداتەوە و دەڵێ «ئەوەی ڕووی دا خەتای تۆ نەبوو بەڵکو تەنیا ڕیکەوت بوو«. هەموو ڕۆژێ پاش تەواوبوونی کارەکەی نەورۆز کە هاوڕێی نزیکی دایکیەتی دێنە لای هەتاو و هەر یەکەیان دەست دەخەنە دەستێکی و بە نۆرە قسەی لەگەڵ دەکەن. نەورۆز هەموو ڕۆژێ چەند لاپەڕەیەک لە یادەوەرییەکانی خۆی بۆ دەخوێنێتەوە بەو هیوایەی یارمەتیی بدات و هۆشی بێتەوە سەرخۆی. لەوانە بوو گەر هەتاو هۆشی لای خۆی بووایە هەرگیز ڕازی نەدەبوو ئەوان یادەوەرییەکانی بخوێننەوە.

هەردووکیان زۆر حەزیان لە خوێندنەوەی نهێنییەکانی ژیانی هەتاو بوو. ئەمەیش هەلێکی باش بوو بۆ هەردووکیان تا بیقۆزنەوە و بە بیانووی ئەوەی خوێندنەوەی ئەم یادەوەرییە هەتاو بە ژیانییەوە

دەبەستێتەوە. هەموو ڕۆژێ کاتێکی دیاریکراو دادەنرا بۆ خوێندنەوە. ئەو کاتە هانس لەسەر ڕانی نەوڕۆز دادەنیشێ و ئەویش بە دەنگە گڕەکەی هەموو ئێوارەیەک بە هێمنی یادەوەرییەکانی دەخوێنێتەوە. ددان بە هەموو وشەیەکدا دەنێت، لەگەڵ هەموو ڕستەیەکدا ئاوازێک دروست دەبێت کە لە ئاوازی سیمفۆنیاکانی «باخ»ەوە نزیکە. لەوانەیە ئەم ساتە خۆشترین ساتی هەردووکیان بێت. هانس لە تەمەنی شەش ساڵانەوە داوای لە دایکی دەکرد فێری زمانی کوردیی بکات، ئەویش دەیگوت کە فێری خوێندنەوەی سوێدی بوویت ئەوسا فێری کوردیت دەکەم. هانسیش زۆر مەبەستی بوو فێری خوێندنەوەی کوردی ببێت. بەو نیازەی بتوانێ بە دزییەوە یادەوەرییەکانی دایکی بخوێنێتەوە. ئەو نهێنییانەی کە دەیەوێ لەبارەی باوکیەوە بیزانێ، مەگەر لە دووتوێی بیرەوەرییەکانیدا بێت. ئەو دەیزانی دایکی کەسێکی داخراوە، خەمگینە، بارێکی قورسی بەسەر شانەوەیە. باسی کوردستانی بۆ دەکات، باسی دایەگەورە و براکانی خۆیی بۆ دەکات. ئەی چۆن و کەی پەیوەندی بە کەسوکاریەوە دەکات، باسی ناکات. دایکی تا بڵێی کەسێکی میهرەبانە، هەموو جەستەی خۆشەویستییە. بەردەوام حەزی لەوەیە سەری بخاتە سەر سنگی دایکی و خەو بیباتەوە. هەندێ جاریش دایکی پێی دەڵێت: «بیرت نەچێت چەند ساڵێکی تر گەورە دەبیت و حەزت لە باوەشی من نابێت بەڵکوو دەچیتە باوەشی ئەو کچەوە وا حەزت دەچێتە سەری». هانس سوور هەڵدەگەڕێ و لە دایکی توورە دەبێت. ئەوجا دایکی دەڵێت «هانس! دەبێت بەڵێنم پێ بدەی کە کەوتیتە داوی خۆشەویستیی هەر کچێکەوە ئاگادارم بکەیتەوە، من دەمەوێت ئەو ڕێگایەت بۆ گوڵڕێژ بکەم. من دەمەوێت ئەو گۆرانیەت بۆ بڵێم کە تەواوم نەکرد.»

چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەی دەکرد کە دایکی نهێنییەکانی ژیانی بۆ ئاشکرا

بکات. بۆیە بەردەوام بە دوای سەرە دەزوویەکدا دەگەڕا تا بیگەیێنێتە بەر دەرگای ئەفسانەی ژیانی دایکی. هەموو شەوێ ئەوی دەخەواند، دوو مۆمی لە هۆڵەکەدا دادەگیرساند و پێکی شەرابی دادەنا و دەستی دەکرد بە نووسین. پاشان دەفتەری بیرەوەرییەکانیی دەشاردەوە. شوێنی ئەم دەفتەرە لای هانس مەتەڵێکی هەڵنەهێنراو بوو. لەگەڵ ئەوەی نەیدەتوانی بیخوێنێتەوە، بەڵام کە دایکی لە ماڵ نەبووایە کون بە کونی ماڵەکە دەگەڕا تا بیدۆزێتەوە. زۆر شەو هانس بە دزییەوە لە ژوورەکەی دەهاتە دەرەوە و دەیویست بزانێ کاتی خەوتنی ئەم، دایکی چ دەکات. هەموو شەوێک دایکی هەر ئەو کارەی دەکردەوە. لە ژوورەکەی خۆی دەفتەرەکەی دەهێنایە دەرەوە و دوو مۆمەکەی دادەگیرساند و پێکە شەرابەکەی لە مووبەقەکە دەهێنا و لەبەر تیشکی مۆمەکەدا دەفتەرەکەی دەکردە سەکۆی خەمەکانی. زۆر جار لەگەڵ وشەکاندا پێدەکەنی یان دەگریا. پاشان دەفتەرەکەی دادەخستەوە و پەرداخە شەرابەکەی دەبردەوە بۆ مووبەقەکە و مۆمەکەی دەکوژاندەوە. ددانی دەشۆرد و دەچووە ژووری نووستنەکەی و سیدێی مۆسیقایەکی هێمنی دەخستە سەر. ئەو بە شەوان هەر گوێی لە مۆسیقا دەگرت و بە ڕۆژیش گوێی لە گۆرانیی کوردی دەگرت. بە تایبەت زۆر حەزی لە دەنگی بەهجەت یەحیا بوو. ئەوەندەی گوێ لێ گرتبوو هەردووکیان فێری وشەی گۆرانییەکانی بووبوون. هەتاو کە دەیبینی هانس وشەی گۆرانییەکان دەڵێتەوە، باوەشی پێیدا دەکرد و بەرزی دەکردەوە و هەردووکیان لە هۆڵەکە سەمایان دەکرد. هانس ئەم ساتانای زۆر پێ خۆشبوو، بۆیە بەردەوام هەوڵی دەدا وشەی ئەو گۆرانییانە لەبەر بکات وا دایکی حەزی لێیان بوو. هەرچەندە لە وشەکانی نەدەگەییشت و ئاوازەکەیشی پێی سەیربوو. لەوەیش نەدەگەییشت دایکی چ خۆشییەک لەو ئاوازە سەیرانە وەردەگرێ. بۆ ئەو، ئاوازی گۆرانییەکان هەموو

وەک یەک وابوون، وشەکانیشی گران بوون. تەنیا ئەوەندەی دەزانی ئەو گۆرانییانە باسی عەشق و خەم دەکەن. بۆیە هەر لە سەرەتاوە عەشق و خەم دوو وشەی پەیوەندداربوون بە یەکەوە. ئەو شەوانەی دایکی کارەکەی جاری جارانی نەدەکرد، دەچووە باڵکۆنی ماڵەکەوە و جگەرەی دەدا بە دەم جگەرەوە، تا ماوەیەکی زۆر نەدەهاتە ژوورەوە. هانس لەو شەوانەدا ئێجگار نیگەرانی دایکی دەبوو. ئەو گوێی نەدەدا بە سەرمای ئەو شارە. بەتانییەکی لە خۆیەوە دەئاڵاند و پاکەتەکەی لەگەڵ خۆیدا دەبردە دەرەوە. هانس هەموو فرت و فێڵێکی دەکرد تا دایکی زوو بێتە ژوورەوە و لەبەر ئەو سەرمایە نەمێنێتەوە، کەچی کەڵکی نەبوو. ئەو دەترسا دایکی نەخۆش بکەوێت، ئەو کات ئەو چی بکات.

لە نەورۆز زیاتر کەسێک نییە لەو شارەدا بڕوای پێ بێت. دایکی هێندە لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵ نەدەبوو، هاتوچۆی کەسی نەدەکرد. تەنیا کەسێک کە دەهاتە ماڵەوە ئەو بوو. لە دەرەوەی ماڵەوە هەندێ ناسیاو و هاوڕێی خۆیی دەبینی. هانس لەوەیش نەدەگەییشت بۆ دایکی بەردەوام بە وردی سەرنجی داخستنی دەرگا و پەنجەرەکان دەدا. کە دەیبرد بۆ قوتابخانە تا نەیدایێتە دەست مامۆستاکان بەجێی نەدەهێشت. ئەو هیچ شەوێک کاری نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەی لە کاری شەودا پارەیەکی زۆری وەردەگرت. ئەو وایدەزانی دایکی کاری شەو ناکات لەبەرئەوەی زۆر حەزی لە ڕۆتینەکانی خۆیەتی. ساڵ و نیوێکە دایکی وەک پزیشک کار دەکات. وەک پزیشکێکی زۆر زیرەک باسی دەکرا. ئەویش شانازی بەمەوە دەکرد، بەتایبەتی کە منداڵەکانی هاوڕێی باسی زیرەکییەکەی دایکی دەکەن. دیارە ئەوانیش لە دایک و باوکی خۆیانەوە گوێیان لێ بووە. ئەوان لە شارێکدا دەژییتن، هێندە گەورە نییە. دەکەوێتە باکووری سوێدەوە، دانیشتووانی ئەو ناوچەیە یەکتر دەناسن. «نەورۆز»یش

هەر وەک دایکی پزیشکە. بەڵام کەس باسی زیرەکیی ئەو ناکات. لەو شارەدا تەنیا چەند سەررەشێک دەژییتن. تەنیا ئەمان و نەورۆز کوردن. لەوانەیشە بۆیە هێندە پەیوەندییەکەیان وا بەهێز بێ. هانس نەیدەزانی گەرمی ئەم پەیوەندییە لە کوێوە سەرچاوە هەڵدەگرێ. دەیزانی هەردووکیان دایکییان خۆش دەوێت و هەردووکیان بەدوای نهێنییەکانی دایکیدا دەگەڕێن. نەورۆز سەردانی دەکردن. زۆرجار پێکەوە لە مووبەقەدا نانیان دەخوارد و پاشان شەرابەکەیانیان دەبردە هۆڵەکە و لەوێ ماوەیەکی زۆر دەمانەوە. دەمەوئێواران نەورۆز دەچووەوە ماڵەوە. هانس بە دزییەوە لە کونی دەرگاکەیەوە تەماشای دەکردن، تا بزانێ داخوا نەورۆز و دایکی دەم دەخەنە ناو دەمی یەکترییەوە یام نا، ئەو دەیزانی ماچی ناودەم نیشانەی خۆشەویستییە. کەچی کە دەڕۆیشت ئەملاوئەولای یەکترییان ماچ دەکرد و تەواو. ئەم جۆرە ماچانەیش تەنیا نیشانەی هاوڕێیەتین. هانس لەگەڵ ئەوەی منداڵ بوو بەڵام زۆر ورد و وریا بوو. تەنیا بە گوێگرتن زۆر شت لەسەر ژیان فێر بووبوو. منداڵی ئەم سەردەمە و هی ئەم وڵاتانە لە هەوایشەوە شت فێر دەبن. تەنیا شتێک وا هانس ناتوانێ بیزانێ نهێنی دایکی و ئەو باوکەی بوو کە هیچی لەسەر نازانێ. دایکی هەر ئەوەندە دەڵێت کە ئەوان زۆر یەکترییان خۆش ویستووە. دایکی بەڵێنی پێی دابوو کاتێ گەورەتر ببێت تەواوی چیرۆکەکەی بۆ باس دەکات. هانس هەستی دەکرد ئەو ناتوانێ چاوەڕوانی ئەوە بکات تا گەورە دەبێت ئەوسا گوێی لە تەواوی چیرۆکەکە بێت. بۆیە هەر لە تەمەنی پێنج ساڵانەوە بە دوای ئەو نهێنییەدا دەگەڕا. کە نەورۆزیش هاتە ناو ژیانیانەوە، هەردووکیان مەراقی ئەوەیان بوو شتێ لە ژیانە ڕابردووەکەی هەتاو بزانن. هەردووکیان هەتاویان تا سەر ئێسقان خۆش دەویست و هەموو شتێکیان دەکرد بۆ بەختەوەریی هەتاو. دەیانویست ئەو نهێنییە بدۆزنەوە

وا خەم و ژانی بۆی هێناوە.
چ ڕێکەوتێکی سەیربوو، ئەم بیرەوەرییانە هەموو ئەو نهێنیانەی بۆ هانس و نەورۆز ئاشکرا کرد. ئەو نهێنیانەی ماوەیەکی زۆرە بە دوایدا سەرگەردانن. هەر ئەو نهێنییانە بوو خۆشەویستییەکەی هەردووکیانی قووڵتر کردەوە و هەردووکیان پێکەوە بڕیاریان دا هەرگیز هەتاو جێ نەهێڵن و هەر چییەکیان لە دەست دێت بیکەن بۆ وەهۆشهێنانەوەی هەتاو. نەورۆز بڕیاری دا تاسەر لەپێناو گەییشتن بە هەتاودا کۆڵ نەدات. جارێک خۆی لەبەر بارودۆخی سیاسی هەتاوی جێ هێشتبوو و دووەم جاریش هەتاو ئەمی جێ هێشت، بەڵام ئەمجارە بەنیازە بەجێی نەهێڵی و کۆڵ نەدا. خۆشەویستنی هەتاو لە دەروونی نەورۆزدا تەمەنی چەندان ساڵە. تەمەنێکی دوورودرێژە ئەم خۆشەیستییە لە دڵی ئەمدا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ قووڵتر دەبوویەوە. لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانکارییانەی لە ژیانی هەردووکیاندا ڕوویان دا کەچی خۆشەویستیی هەتاو بەردەوام وەک دارێک ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گەورەتر دەبوو. لەناو هەموو بوونەوەرەکاندا تەنیا دارە بەردەوام گەورە دەبێت، بۆیە نەورۆز هەردەم دەیگوت ئەو دارەی لە دڵی مندا ڕوواوە تامردن هەر گەورە دەبێت. حەزی دەکرد ئەفسانەی خۆشەویستییە هەمیشەیییەکەی خۆی بۆ هانس بگێڕێتەوە. دوایی پەشیمان دەبوویەوە، لەبەرئەوەی ئەو هێشتا منداڵە و ناتوانێ لەو بارە قورسانەی ژیان بگات. نایەوێ باری لەوە زیاتر گران بکات. ئەو ڕۆژەی باش لەبیرە کە گەیشتە سوێد، هانس ئەو کاتە تەمەنی تەنیا چوار ساڵ و نیوێک دەبوو. چوون بۆ ستۆکهۆڵم بە دوایدا و شەو لە هوتێلێکدا مانەوە، هەر یەکە لە ژوورێکدا بوون. وایدەزانی هەر کە هەتاو ببینێ خۆی فڕێ دادەتە ئامێزی و توندتوند بەخۆیەوە دەیگووشێ، لێوە نوقڵییەکەی وەک شانەی هەنگوین دەمژێت.
کاتێ لە فڕۆکەکەدا دانیشتبوو، بیری لەوە دەکردەوە کە نیگای کەوتە

سەر هەتاو چی دەکات. بە هەموو هێزمەوە بەرەو ڕووی ڕادەکەم و لە ئامێزی دەگرم و بەری نادەم تا هەناسەم تێکەڵ بە هەناسەی دەبێت و ترپەی دڵم لەگەڵ ترپەی دڵیدا جووت دەبێت. بەری نادەم تا تاسەم دەشکێ. هیچی وا نەبوو، هەتاو ئەو هەتاوە نەبوو کە ئەم دواجار بینیبووی، دەمووچاوەکەی هەروەک جاران فریشتەیی بوو، بەڵام جوانییەکەی جارانی نەمابوو. ڕەنگە سەوزەکەی چاوەکانی وەک سەوزایەتییەکەی گەڵای دارێکی تینوو بوو. ئاڵی گۆنای وەک بەفر توابوویەوە، لێوەکانی بەدوای ڕەنگی پەمەییدا دەگەڕان. لە دوورەوە چاوەڕوانی دەکرد و دەستی کوڕێکی گەش و جوانی گرتبوو، وا هەستت دەکرد ئەو دەستە سەرچاوەی ژیانی ئەوە. بەردانی ئەو دەستە مانای کۆچی هەناسەکانە. هەتاو لێی نزیک بوویەوە دەستی برد تەوقەی لەگەڵ بکات، ئەم گوێی نەدایە و لە ئامێزی گرت. ئەو ئامێزەیەی ساڵانێکە خەوی پێوە دەبینێ. کاتێ شەوان سەری دەخستە سەر سەرینەکەی جیهانێکی خەیاڵیی بۆ خۆی دروست دەکرد، هەر ئەو جیهانە بوو، هێزی دەدایە دڵەکەی نەورۆز. لە خەیاڵی خۆیدا لە ئامێزی هەتاودا خەو دەیبردەوە، کە بەیانی خەبەری دەبێتەوە، تەماشایەکی دەموچاوە پڕ ڕووناکییەکەی هەتاوی دەکا و ڕۆژێکی تیشکاوی دەست پێ دەکاتەوە. فرمێسکەکانی هەردووکیان هاتنەخوارەوە، خوڕەی فرمێسکەکانیان بە دەست خۆیان نەبوو. هەردووکیان بۆ خەمی خۆیان دەگریان، خەمەکانیان دوو ڕەنگی جیاوازیان هەبوو، کەچی ناوەڕۆکەکەیان وەک یەک بوو. هەروەک چۆن گوڵەدالیا ڕەنگی جیاوازی هەیە. هەر یەکە لەو ڕەنگانە جوانییەکی تایبەتی دەدا بەو گوڵە، ڕەنگەکان هەرچییەک بن جوانییەکان هەر یەک ناوەڕۆکیان هەیە، گوڵەکەش هەر گوڵی دالیایە. خەمەکانی ئەمانیش خەمی لەدەستدانی خۆشەویستییە و خەمی ژانێکی بەردەوامە، خەمی جیاوازێکە جگە لە وشەی فرمێسک، وشەیەکی تر

هه‌ڵنابژێرێ بۆ هۆنراوه‌ی گۆرانییه نه‌درکاوه‌که.

ده‌ستی کوڕه‌که‌ی به‌رنه‌داو هه‌رسێکیان سواری ته‌کسی بوون، به‌ره‌و هوتێله‌که چوون که نزیکه‌ی سه‌عاتێک دوور بوو له فرۆکه‌خانه‌که‌وه. نه‌وڕۆز له پێشه‌وه دانیشت و هه‌تاو و هانس له دواوه دانیشتن. به درێژایی ڕێگاکه ته‌نیا هانس هه‌ندێ جار پرسیاری له دایکی ده‌کرد و ئه‌ویش به چپه وه‌ڵامی ده‌دایه‌وه. ئه‌وه یه‌که‌مین جار بوو هانس بێته شاری ستۆکهۆڵم. ئه‌م شاره له‌چاو ئه‌و شاره‌ی که ئه‌وی تێدا له‌دایکبووه، گه‌وره و جیاوازه. نه‌وڕۆز زوو زوو لای له هه‌تاو ده‌کرده‌وه ده‌یویست قسه‌یه‌ک بکات و هه‌ر زوو په‌شیمان ده‌بوویه‌وه. نه‌یده‌زانی له کوێوه ده‌ست پێبکات. بیری له‌وه ده‌کرده‌وه چۆن ئه‌و هه‌موو قسه‌یه‌ی له‌ماوه‌ی ئه‌م هه‌موو ساڵه‌دا له دڵیدا هه‌ڵیگرتوون هه‌ڵیانڕێژێته به‌رده‌م هه‌تاو. دووریی بۆ ئه‌م تۆزقاڵێ له خۆشه‌ویستی هه‌تاوی که‌م نه‌کرده‌وه‌و به‌رده‌وام گوێ له ترپه‌ی دڵی بوو، وا ئێستاش ته‌نیا یه‌ک مه‌تر لێیه‌وه دووره که‌چی ناگاته دڵی. نیگای چاوه‌کانی له ئاسمان دوورتربوون. بۆیه بڕیاری دا هه‌ر به‌بێ ده‌نگی بمێنێته‌وه. گه‌یشتنه هوتێله‌که، دابه‌زین و هه‌تاو پاره‌که‌ی دا. نه‌وڕۆز ته‌نیا جانتایه‌کی بچووکی پێ بوو، ئه‌وانیش جانتایه‌کی شانیان پێ بوو که هه‌ر جلی خه‌ویان تێدا بوو. هه‌تاو تۆزێک ڕاوه‌ستا و سه‌یرێکی ده‌وروبه‌ریی کرد، تا بزانێ هیچ یاده‌وه‌رییه‌کی له‌م ناوچه‌یه‌دا هه‌یه یام نا. له ناکاودا پێش چاوی ڕه‌ش بوو، هێنده‌ی نه‌مابوو بکه‌وێت، نه‌وڕۆز چووه ژێرباڵی و هانس ده‌ستی کرده گریان. هه‌تاو که لای به‌ره‌و شه‌قامه‌که‌ی به‌رده‌م هوتێله‌که کرده‌وه سه‌یاره‌یه‌کی بینی هه‌ر له سه‌یاره‌که‌ی هانسی ده‌کرد. له دڵی خۆیدا وتی بڵێی هه‌تا ئێستا هه‌ر سه‌یاره‌که‌ی جارانی هه‌بێ. ترافیکلایته‌که بوو به سوور، سه‌یاره‌کان وه‌ستان، هه‌تاو ئه‌مجاره ڕووی وه‌رگێڕا و له

سەیارەکە ورد بوویەوە. بینیی ئەوە سەیارەکەی هانسە و ئەوەیش هانسە لێی دەخوڕێت و سەریشی سپی بووە و لە تەنیشتیەوە سارای ژنی دانیشتووە و لە پشتەوەیش هەردوو منداڵەکەی. خێرا دەستی هانسی گرت و بە خێراییەکی سەیرەوە، پەلکێشی ژوورەوەی کرد. نە هانس و نە نەورۆز لەو گۆڕانکارییە لە پڕەی هەتاو تێنەگەیشتن. کە گەیشتنە بەردەم پرسگەی هوتێلەکە هەتاو وا شپرزە ببوو، وشەیەک چییە لە دەمی نەدەهاتە دەرەوە. ماوەیەکی ویست تا هاتەوە سەرخۆی. کلیلی ژوورەکانی وەرگرت و هەردووکیان لە نهۆمی شەش لە تەنیشت یەکەوە ژووریان وەرگرت.

نەورۆز چاوەڕوانی ئەمەی نەدەکرد، هەتاو دەزانێ ئەم چەندی خۆش دەوێت. چووە ژوورەکەی خۆی و لەسەر جێگەکەدا پاڵ کەوت و خەوی لێ کەوت. پاش دوو سەعات خەبەری بوویەوە. هەتاو و هانس لە دەرگایان دا و، ئەمیش دەرگاکەی بۆ کردنەوە. هەتاو وتی «گەر زۆر ماندوو نیت با بچین نانێک بخۆین، ئێمە برسیمانە، چییە خەوت لێ کەوتبوو؟» هەرسێکیان پێکەوە چوونە خوارەوە، لە چێشتخانەکەی هوتێلەکەدا نانیان خوارد. هەتاو دەیویست زیاتر دانیشن تا ئاسمانی شار تاریک ببێت و ئەوجا گەشتێک بە نەورۆز و هانس بکات. ئەو دەیویست بەپەلە ئەم شارە بە جێ بهێڵێ، یادەوەریگەلێکی تاڵ و شیرینی تێیدا هەیە. بۆیە هەستەکانی تێکەڵ دەبوون، گیانی دەشڵەژا. ئەوە زیاتر لە چوار ساڵە سەری نەکردبوو بەم شارەدا. ئەم هاتنە، دەروونیی هەژاند، گەر هاتنەکەی نەورۆزیش نەبووایە هەرگیز نەیدەویست بۆ ساتێکیش چییە بێتە ئەم شارە. زۆر جار دەیویست خۆشەویستیی هانس لە یاد بکات و وەک خونچەیەکی تازەپشکووتوو لە چڵەکەی بیکاتەوە. دەیگوت گەر هانس منی بەو ڕادەیە خۆش بویستایە، هەر

دەیدۆزیمەوە. ئەوان خەڵکی ئەم وڵاتەن و کون و کەلەبەری دەزانن، ڕاستە من بە شێوەیەکی تاریکاوی بە جێیم هێشت بەڵام خۆ ئەو دەیزانی من لە چ بارودۆخێکدا دەژییتم. ئێستایش دیارە گەڕاوەتەوە بۆ لای ژن و منداڵەکانی. زۆرم هەوڵدا سەرلەنوێ ژیانێکی تازە دەست پێ بکەمەوە، نەمتوانی. هەرچەند دەکەم ناتوانم بچمە ئامێزی پیاوێ کە خۆشیم ناوێ. چونکە دەزانم خەوتن لە ئامێزی پیاوێکدا کە خۆشیت ناوێ چ ئازارێکە. من هەردووکیانم تاقی کردووەتەوە. دەزانم جیاوازییەکەیان چۆنە. بە لامەوە سەیرە زۆربەی ژنەکانی خۆمان شوو بە پیاوێک دەکەن کە خۆشیان ناوێ، لەو کاتەدا ژیانی ژن و مێردایەتی وەک ئەوە وایە ناچار بیت خواردنێ بخۆیت کە حەزت لێی نەبێت و ناچاریش بیت بیخۆیت لەبەرئەوەی برسیتە. کەسیان تامی خواردنەکانی تریان نەکردووە، بۆیە جیاوازییەکەیان نازانن. تازە شووم کردبوو بەو بەدشوومە، هەموو شەوێک تێر دەگریام. وا هەستم دەکرد جەستەی خۆم دەفرۆشم، بۆ خۆم نا بەڵکوو بۆ کەسانێ وا نرخی ئەو قوربانیدانەی من نازانن. هەڵبەت شانازی بە خۆمەوە دەکەم، وێرام ئەو قەفەزە بشکێنم و بفڕم. هەرچەندە ئازارم زۆر چەشت بەڵام خۆمم گرتەوە. ئێستا خوێندنەکەمم تەواو کردووە و هانسیشم بووە، هانس بە هەموو جیهان ناگۆڕمەوە. ئەو بەختەوەرییەی بوونی هانس پێم دەیبەخشێ هیچ هێزێک نییە لە جیهاندا پێمی ببەخشێ. کە هاتمە ئەم شارە ترسی داهاتووم لێ نیشتبوو. سارا هەموو پێداویستییەکانی بۆ دابین کردم. ئینجا بە جێی هێشتم. تا ساڵێکیش هەر پەیوەندیی دەکرد پێمەوە. لەو ماوەیەدا نە من هەواڵی هانسم دەپرسی نە ئەویش باسی دەکرد. لەوانە بێت سارا هانسی لەڕادەبەدەر خۆش بوێت بۆیە هەموو ڕێگایەکی گرتە بەر تا منی لێ دوور بخاتەوە. لەوانەیە هەقی خۆیشی بووبێت، ڕەنگە منیش هەر ئاوەهام بکردایە بۆ ئەو کەسەی زیاتر لە بیستوپێنج ساڵ

خۆشیم ویستووه. سارا ژنێکی زۆر بەهێز بوو، ئەو هانسی بردەوە لە من، بەڵام باوەڕ ناکەم توانیبێتی دڵی هانس بباتەوە. ئەو ماوە کورتەی لەگەڵ هانسدا دەژییتام، هەستم دەکرد چەند منی خۆش دەوێت. کە لە ئامێزی دەگرتم هەستم دەکرد هەموو جەستەی دەبوو بە بۆنی گوڵەباخ و لە ڕۆحی من دەئاڵا. هەستم بە تامی ماچە هەنجیرییەکانی دەکرد. هێندە دڵی خۆش دەبوو، بەختەوەری لە چاوەکانیدا تیشکی دەدایەوە. خۆیشم نازانم چۆن پاش لەدەستدانی ئەو خۆشەویستییە خۆمم گرتەوە.

لە یادمە کە هاتمە ئەم شارە، فرەتر لە هەفتەیەک لە ئاو زیاتر هیچم بۆ نەدەخورا، هەموو ماڵەکەمم تاریک کردبوو، چاوەڕوانی ئەوە بووم بە هێمنی و لە برساندا بمرم. کەچی بەیانییەک زوو تیشکێکی باریکی ڕۆژ لە درزی پەردەی ژووری نوستنەکەوە ختووکەی دەموچاومی دەدا. کە چاوم کردەوە ئەو ڕووناکییە خۆی خزانە دڵمەوە. هەر لەو ساتەدا هەستم بە بوونی ڕۆحێک لەناو جەستەمدا کرد. بەتانییەکەم لەسەرخۆم لابرد. ئەو کراسەی هەفتەیەک بوو لەبەرمدا بوو دامکەند. هێزم دایە قاچەکانم و هەڵسامە سەرپێ. چووم تێر ئاوم خواردەوە. ئەوجا چوومە حەمامەکەوە و ئاوی دووشەکەم بەردایەوە، خۆمم خستە ژێر ڕێژەنەی ئاوەکەوە. نازانم چەند لە ژێر ئەو ئاوەدا مامەوە... دوو سەعات... شەش سەعات یان چەند ڕۆژێ. ئەو ئاوە ژیانێکی نوێی پێ بەخشیم. پاش ئەوەی لە حەمامەکە هاتمە دەرەوە، خاولییەکم لە جەستە تەڕە ماندووە برسییەکەم ئاڵاند و لەسەر جێگەکەم ڕاکشامەوە. بەڵام ئەمجارەیان پەردەکانم لا دا تا تیشکی خۆرەکە ژوورەکەم داگیر بکات. بە ڕووتی خۆمم دایە بەر تیشکی خۆرەکە و کەوتمە پاڕانەوە لە ئاو و تیشکی خۆر، لەبەر خاتری ئەو ڕۆحەی لە جەستەمدا هەڵم

گرتووه یارمەتیم بدەن. داوام لێ کردن برینەکانم سارێژ بکەن، هێزم پێ ببەخشن. ئەو ساتە لە دڵەوە دەمویست ئەو منداڵەم بێت و لە ئامێزی بگرم و هەموو ژیانمی بۆ تەرخان بکەم. ئەوەیشم کرد، ئەم کوڕە ئازیزەم بوو، ناویشیم نا هانس، هەروەک باوکی. ئیتر پاش ئەوە خەمی پرسیارەکانیم بوو. هانس بەردەوام هەواڵی باوکیی دەپرسی. بەڵێنم پێی داوە باسی باوکی بکەم بۆی و بیانناسێنم بە یەک تری. من فریا نەکەوتم باوکی ئاگادار بکەمەوە. پلانەکانی سارا هەموو ژیانی گۆڕیم. نازانم تا کەی ئەم نهێنییە لای هانس نەدرکێنم. تەنیا دڵم بە هاتنی نەورۆز زۆر خۆشە، ئەو هەردەم بۆ من هێزێکی پڕ لە خۆشەویستی و گەرمی بووە. لە هیچ کاتێکدا پشتی بەر نەداوم. لەو باوەڕەدام دەتوانێ ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانی هانسیشدا بگێڕێ.

ئەو ئێوارەیە هەرسێکیان چوون نانیان خوارد، نەورۆز لەوەی دەکرد هێندە حەزی لە خواردنەکە نەبێت، هەوڵی دەدا هەرچۆنێ بێت پاروەوە نانەکە قووت بدات. ئەو بیری بە خواردنەکەوە خەریک نەبوو، بەڵکوو بیری لای هەتاو بوو. دەیزانی هەتاوەکەی جاران نییە، ئەو هەموو ڕووداوانـەی بەسەر هەتاودا هات کەم نەبوو، خۆ ئەو پێش ئەوەی سەفەرەکەی بکات هەتاو زۆر بە ڕاستگۆییەوە باسی خۆی کردبوو بـۆی. هاتنەکەیشی بۆ سوێد هەر ئەنجامێکی هەبێت گرنگ نەبوو. بە لایەوە گرنگ بوو لەو ساتانەی کە پێویستی بەمە لە تەنیشتیەوە بێت، بۆیە لە سەفەرەکەی پەشیمان نەبوو. هەندێ شت هەیە دەبێت لە کاتی خۆیدا بکرێ ئەگینا ئەوەی دەتەوێ مەیسەر نابێت. ئەو گەر لە کاتی خۆیدا باسی خۆشەویستییەکەی خۆیی بۆ هەتاو بکردایە و دڵی خۆیی بۆ بکردایەتەوە، لەوانەبوو ئەوەی ڕووی دا ڕووی نەدابا و ئەو هەموو ساڵە ئازاری دووری هەتاوی نەدەچەشت. لەوانە بوو

هەتاویش هەستی بە پاڵپشتێک بکردایە و ئەو بڕیارەی نەدایە. زۆرجار هەستی دەکرد خۆی خەتابارە لەوەی بەسەریاندا هات. دەیزانی خۆی کەسێکی کەمدووی پڕنهێنییە بەڵام چی بکات تازە خووی پێوە گرتبوو. لەوانەیشە تێکەڵبوونی بە کاری سیاسییەوە وای لێ کردبێت بەردەوام هەستەکانی خۆی بشارێتەوە. ئەو سەردەمە ئەوانەی کە تێکەڵ بە سیاسەت دەبـوون، دەبووایـە خۆیانیان بکردایەتە قوربانی ڕێگەی سەختی تێکۆشان. بۆ ئەمەیش دەبووایە هەستەکانیان بمرێنن. کاتێکش بارەکە ئاسایی دەبێتەوە، گۆڕینی ئەو لایەنەی کەسایەتی زۆر گرانە. نەورۆز پاش ڕاپەڕین گەڕایەوە ناو شار. هەتاوی بینییەوە، لەو دوو ساڵەی شاخدا، بەردەوام بیری لە هەتاو دەکردەوە. هەتاو لە ساردترین شەوەکانی شاخدا گەرمی دەکردەوە. لەو ساتانەی کە هیوای بە هیچ نەدەما، خۆشەویستیی هەتاو هێزی پێ دەبەخشی. تەنانەت لەو کاتەیش کە بریندار بوو وا هەستی دەکرد بەرەو تونێلی مردن دەڕوات، کەچی دەموچاوە ڕووناکەکەی هەتاو هیوای ژیانەوەی پێدەبەخشی. گەڕایەوە ناو شار، پاش بینینی دایکی، چووە ماڵی هەتاو. زۆر شت لە ژیانیدا گۆڕابوو. بەڵام تیشکی چاوانی وەک جاران نەورۆزی گەرم کردەوە. هەتاو بە بینینی ئەم زۆر دڵخۆش بوو، بەڵام دەستی شکاوم. ئەو ساتە باشترین سات بوو نەورۆز دڵی خۆی بکاتەوە بۆی و باسی تاسە و هەستە گڕگرتووەکانیی بۆ بکات. مخابن ئەو هەلەی نەقۆستەوە و ئەمەی نەکرد. هەموو جارێ کە دەیبینی، شاگەشکە دەبوو، بەڵام بەهیچ جۆرێ ئەو قسانەی کە بەنیاز بوو بە هەتاوی بڵێ، لە دەمی نەدەهاتە دەرەوە. ئەوەی ڕووی دا ناگۆڕدرێ. گەڕانەوەی کات مەحاڵە. نەورۆز هیچی پێ نەدەکرا هەربۆیە وازی هێنا، ئەمجارەش هەتاوی لە کیس چوو. پاش ئەوەی هەتاو شووی کرد و وڵاتی جێ هێشت، نەورۆز بڕیاری دا تا دوا هەناسەی ژیانی بە هیوای گەیشتن بە هەتاو بژیێت. ئەو

ماوەیە بەردەوام لە ڕێگەی دایکی هەتاوەوە ئاگاداری ژیانی هەتاو بوو. هەرچەندە ماوەیەکی زۆر بوو دایکی هیچ هەواڵی هەتاوی نەدەزانی.

زیاتر لە دوو ساڵ هەتاو و دایکی نێوانیان نەما. ئەو دوو ساڵە ژیانیان زۆر گۆڕا، ئەو دوو برایەی کە هەتاو لە پێناویاندا ڕێگەی جەنگەڵی گرتە بەر، هەردووکیان لەیەک ڕۆژدا و لەیەک ساتدا گیانیان دەرچوو. دایکیان بە تەنیا مایەوە. ئەوەی بەردەوام سەری لێی دەدا و ئاگاداری بوو نەورۆز بوو. هەموو خزم و ناسیاوەکانی پشتیان کردبووە دایکی هەتاو. بەتایبەتی پاش ئەوەی مێردەکەی هەتاو کۆمەڵێ بوختانی بۆ هەتاو هەڵبەستبوو. لەو ماوەیەدا باس باسی هەتاو بوو. چۆن لای مێردەکەی ڕایکردووە و لەگەڵ پیاوێکی سویدیدا ڕادەبوێرێ و هەر بۆیەیش دەتوانێ وا سەفتە دۆلار بۆ دایکی بنێرێتەوە. زۆر لە کەسوکارەکەی چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد هەتاو بگەڕێتەوە و بیکوژن. کەسێکیش لەو خزم و ناسیاوانە هەواڵی دایکی هەتاویان نەدەپرسی. ئەویش ئاواتەخوازی مەرگ بوو، بەردەوام لە خودا دەپاڕایەوە گیانی بکێشێ. زۆر جاریش دەیگوت ئەمە سزای خوایە بۆ من لەبەرئەوەی بە نابەدڵی ئەو کچە نازدارەم بە کەسێکی وا بێقیمەت و حەرامزادە بە شوو دا. ئەوە خەتای خۆم بوو لە پێناو پارەدا کچەکەمم دا بە شوو، ئەوە خۆم بووم کچەکەمم بە پارە فرۆشت بۆیە گەر ئەوە ڕاست بێت کە کچەکەم لە وڵاتی غەریباندا لەشفرۆشی دەکات، ئەوە تێدەگەم. ئەی دەبێت چ بکات، وا هەموو مانگێ ئەو هەموو پارەیە دەنێرێ بۆم، لەوانەیە ڕووی نەیێت قسەم لەگەڵدا بکات. بۆیە نە تەلەفۆنێ بۆ دەکات، نە نامەیەک دەنووسێ، نەوەک لێی بپرسم کچم ئەو پارانەت چۆن دەست دەکەوێت. لە ڕاستیشدا ئەوە هەتاو نەبوو پارەی بۆ دایکی دەنارد بەڵکوو هانس بوو. لە ڕێگەی کوردێکی ناسیاویەوە بەردەوام

پارەی بۆ دایکی هەتاو دەنارد. هانس دەیزانی ونبوونی هەتاو پەیوەندی بە ساراوە هەیە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نەبوو. هەڵەکەی هانس ئەوە بوو هیچ کاتێ بە ئاشکرا باسی هەتاوی لەگەڵ سارادا نەکرد. سارایش خۆی لەو مەسەلەیە لادەدا. هانس ماوەیەکی کورت لەناو ئەو خانووەدا مایەوە کە لەگەڵ هەتاودا تێیدا دەژییتان، بەڵام منداڵەکان و سارا بەردەوام سەریان لێی دەدا. هانس پاش ونبوونی هەتاو ماوەیەک باری دەروونی تێک چوو. لە کارەکەی مووڵەتی نەخۆشییان پێی دا. بۆ ماوەی شەش مانگێ سوێدی بەجێ هێشت و لە وڵاتی نەرویژدا کاری دەکرد. پاشان لەبەر منداڵەکانی گەڕایەوە بۆ سوێد و چووەوە ماڵەکەی خۆیان. کەس لەوە نەگەیشت بۆ هانس پاش ونبوونی هەتاو هەوڵی دۆزینەوەی نەدەدا. ئەمڕۆ هانس و منداڵەکانی هاتنە بەردەمی، چ ڕێکەوتێکی سەیر بوو. هەتاو دەیویست بیر لەو ڕووداوە نەکاتەوە کەچی بێهوودە بوو. هەر سەیارەکەی جاران، هەر هانسەکەی خۆی بە بەردەمیدا تێپەڕین، بێ ئەوەی بتوانی هیچ شتێ بکات.

دەیویست مێشکی لای هانسی کوڕی و نەورۆز بێت. نەورۆز هەوڵی دەدا یەک لە دوای یەک پرسیاری لێ بکات تا بتوانێ بە وردی تەماشای چاوەکانی بکات و لێی تێبگات. دەیویست لە ڕێگای چاوەکانیەوە ئەو هەتاوە بدۆزێتەوە کە چەند ساڵێک لەمەوبەر بەجێی هێشتبوو. کە سەیری چاوەکانی دەکرد کەسێکی ونبووی دەبینی کە هەستەکانی زەوت کراوە لێی و لە کوڕەکەی خۆی زیاتر، کەسێکی تر نابینێت. ئەو دەیزانی ئەو چەند کوڕەکەیی خۆش دەوێت و بۆ هەندەیش خۆشی گەرەکە. ئەوان لە ماوەی ئەو دوو ساڵە پێش سەفەرەکەی بەردەوام پێکەوە قسەیان دەکرد. بە تایبەتی پاش مردنی دایکی هەتاو، پەیوەندییەکەیان خۆشتر بووبوو. نەورۆز تاقە کەسێک بوو هەتاو

دڵی پێی بکرێتەوە. بەتایبەتی کە زانیی هەر ئەو ئاگاداری دایکی بووە. هێمن باسی هەموو ئەو بوختانەی بۆ هەتاو نەدەکرد وا هەڵیانبەستبوو بۆی. باسی ئەو پارەیشیە نەدەکرد کە بەردەوام بۆ دایکی دەنێررا. ئەو نهێنییە دایکی لەگەڵ خۆیدا بردیە ژێر گڵەوە. هەتاو هەوڵی دەدا پرسیارێ یان بابەتێک بدۆزێتەوە و سەری قسەیەک لەگەڵ نەورۆزدا دابمەزرێنێت. هەر پرسیارێکی دەهات بەبیردا، ترسی وەڵامەکەی وەک دەرزی دەچوو بە دڵیدا، بۆیە خێرا پرسیارەکەی لەبیر خۆی دەبردەوە. ئەمجا ڕووی دەمی کردە هانس و گوتی: «هانس باسی نەورۆزم زۆر بۆ کردوویتە، دەزانی ئێمە هاوڕێ بووین و زۆر یەکتریمان خۆش دەویست. ئەو هاوڕییەکی زۆر دڵسۆز بوو.» هانس پرسیی: «گەر ئێوە هێندە هاوڕێ بوون بۆ زەماوەندتان نەکرد. ئەوجا نەورۆز باوکی من بوو، چەند خۆش بوو دەمزانی کێ باوکی منە و لەگەڵ باوکمدا گەورە دەبووم. نەورۆز دەتوانی یارمەتیم بدەیت تا باوکم بدۆزمەوە؟ بەڵام مەترسە تۆ دەبیت بە باوکی پلاستیکیم، دەزانی ئەوە چییە؟ باوکی ڕاستەقینەم نیت بەڵکوو وەک باوکێ لەگەڵ ئێمەدا دەژییتیت و ئاگات لە من دەبێت، منیش هەفتانە سەردانی باوکی بیۆلۆژی خۆم دەکەم.»

ئەم قسانە هەردووکیانی خستە گێژاوێکەوە، هەر یەکە بە شێوەیەک لە قسەکانی هانس دەگەیشتن و لە سوچێکەوە تەماشای مەسەلەکەیان دەکرد. هەردووکیان تەماشای یەکیان کرد و پێکەنین. یەکەمین جار بوو نەورۆز پێکەنین لەسەر ڕووە ژاکاوەکەی هەتاو ببینێت. هەتاو دەمێک بوو باوەڕی بە چارەنووس هێنابوو، فێریش بووبوو کە ڕووبەڕووی چارەنووس نەبێتەوە. ئەزموونی ژیان ئەوەی بۆی دەرخستبوو شەڕکردن لەگەڵ چارەنووسدا کارێکی مەحاڵە. هەربۆیە پاش ماوەیەک خۆیی دا بە دەست چارەنووسەوە و لەماڵەکەی خۆیدا سەری کز کرد

و بڕیاری دا تەنیا بیر لەو ساتە بکاتەوە کە تێیدا دەژییتێت. بیرکردنەوە لە ڕابردوویەک وا تێپەڕیوە و ناتوانی هیچ شتێکی تێدا بگۆڕی کارێکی بێسوودە و تواناکانی مرۆڤ دەژاکێنێتەوە. کە بەیانیان هەڵدەستا لەخەو، تەنیا بیری لەو ڕۆژە دەکردەوە کە چی بکات. بە لای ئەوەوە گرنگ بوو هەموو ڕۆژێ خواردن بخوات و هەموو بەیانیەکیش لە سکی ورد ببێتەوە تا بزانێ چەند سکی گەورە بووە. پێشتر وای دەزانی ئەو ساتەی بە ڕۆح و جەستە لەناو هانسدا توایەوە خۆشترین ساتی ژیانی بوو، بەڵام نەیزانی ئەو کاتەی گوێی لە ترپەی دڵی ئەو کۆرپە بچووکەی ناو منداڵدانی بوو، خۆشترین ساتی ژیانی بوو. هەر ئەو ترپەیشە بووە پەرجۆ و مانای ژیانی پێی بەخشی و لاپەڕەی یەکەمی ژیانێکی نوێی کردەوە بۆی. هەر ئەو ڕۆژە بوو بڕیاری دا دەست بکات بە خوێندنی زمانی سوێدی و خوێندنەکەی تەواو بکات و ببێت بەو دوکتۆرەی وا باوکی خەوی پێیەوە دەبینی.

ماوەیەکی زۆربوو خەوی بە باوکیەوە نەدەبینی و نەدەهاتە لای. زۆرجار دەیگوت دیارە باوکم ناڕازییە لێم بۆیە بە لامدا نایێت. نازانم لەو دنیاکەدا باوکم چۆن بیر دەکاتەوە، لەوانەیە لەو باوەڕەدا بێت من ڕێگەیەکی چەوتم گرتووەتەبەر بۆیە لێم زیزە و لە ژیانمدا دیاری نییە. هیوادارم ببینێ من لە ساتە سەختەکانی ژیانمدا چەند پێویستم پێیەتی.

هەتاو ئەوەی لە دەستی دەهات کردی هەتا بەبێ یادەوەرییەکانی بژییێت. ئەمەیش کارێکی ئاسان نەبوو. کاروباری ڕۆژانەی چڕوپڕ بوو. وەک ئەوە وا بوو تەنیا خۆی و کوڕەکەی لەم ژیانەدا هەبن، کەسێکی تری نەدەبینی. زیرەکییەکەی لەوەدابوو کە توانیی خۆی لە

هەموو وردەکارییەکانی ڕابردوو داببڕێ. هەربۆیە توانیی لەسەر پێی خۆی بوەستێ، ئەو کارەی هەتاو کردی هێندە ئاسان نییە. هێزێکی بێئەژماری پێویستە بۆ ئەوەی پاش ئەو هەموو تێکشکانە بتوانێ سەرلەنوێ دەست بە ژیانێکی نوێ بکاتەوە.

تاکە شتێک وەک ئاگرێکی نەکوژاوە لەدەروونیدا بەردەوام دەسووتا خۆشەویستی هانس بوو. ئەو کارە سەیرەی ئەم کردی ئەوەبوو دەیویست ئەو هەستە خۆشەویستیەی بۆ هانس هەیەتی لە دەروونیدا بیپارێزێ بێ ئەوەی بیر لە هانس بکاتەوە. ئەمەیش هەروەک ئەوە وابوو ئاوی کانیاو بنۆشی بێ ئەوەی گرنگ بێت بەلاتەوە سەرچاوەکەی لە کوێوە دێت. ئەمەش مەحاڵ بوو. دواجار چۆکی داداو نەیتوانی لەو شەڕەدا بەردەوامبێت بۆ جیاکردنەوەی هەست و سەرچاوەی هەستەکە. بیرکردنەوە لە هانس هەردەم وەک سێبەر بەدوایەوە بوو. دەیویست ساتێ هەبێت کە بیر لەو نەکاتەوە، یادگارییەکانی لەگەڵ هانسدا تێکەڵ بە بوونی ببوو. بەبێ بیرکردنەوە لەو ساتانە ئەو نەیدەتوانی بژی. نەشی دەزانی چۆن بتوانێ ئەو پیاوەی گەرمترین ئامێز و درێژترین ماچی پێبەخشی لەبیربکات. تەنیا دوو پیاو هاتنە ژیانییەوە. پەیوەندی لەگەڵ هەردووکیاندا بە کارەسات کۆتایی پێهات. هەردوو کۆتاییەکە ناچاری کرد سەرلەنۆێ دەست پێبکاتەوە.

ئاخر ئەم هێشتا نەبووەتە سی ساڵ، ئەم هەموو نەهامەتیانە چییە بەسەری هاتووە. کەبیر لەخۆی دەکاتەوە هەر لەمنداڵییەوە تا ئێستا چی بەسەرهاتووە، تەواو ڕەشبین دەبێ. خۆ ئەو منداڵەی نەبووایە دەمێک بوو کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنابوو. تەنانەت زۆر جاریش پلانی خۆکوشتنی دادەنا، کەچی هیچ جارێ سەرینەدەگرت. ئەوەی

بەلایەوە سەیرە هەر کاتێ ئەو بیرۆکەیە دەهات بە مێشکیدا لەناکاواو لە سەرچاوەیەکی نادیارەوە هێزێکی پەمەیی دەڕژایە ناو دەروونییەوە ئەو بیرۆکەیەی لە مێشکیدا دەسڕیتەوە.

- 2 -

هەتاو لە هەموو ژیانیدا وەک ئێستا ئاسوودەو هێمن نەبووە. زۆر جار کە پزیشکەکان تەماشای دەموچاوی دەکەن، هەست بەو ئارامییە دەکەن لە دەموچاویدا. هەموو ڕۆژێ هانس و نەورۆز دێن بۆ لای. هەموو ڕۆژێکیش بیرەوەرییەکانی بۆ دەخوێننەوە. بیرەوەرییەکانی هەتاو ئەو ڕاستییانەن کە هەردەم ویستوویەتی بۆ کوڕەکەی باسبکات. وەڵامی ئەو پرسیارانەیە وا کوڕەکەی لێیپرسیوەو وەڵامی نەداوەتەوە. ئەو زۆر دڵی خۆشە وا ئەم بوارەی بۆ خولقاوە. هانس یادەوەرییەکانی دایکی لە نەورۆز وەردەگرێ و لە ژوورەکەی خۆی دەیشارێتەوە و نایەوێ نەورۆز بەبێ ئەو نهێنییەکانی دایکی بزانێ. ئەوەش نازانێ

ئەو لە کاتی خوێندنەوەی یادەوەرییەکاندا زۆر شتی لێدەگۆڕێ، ئەو شتانەی هێشتا زووە بۆ هانس گوێی لێ بگرێت. هانس لەوە گەیشتووە نەورۆز دایکی خۆشدەوێت. تەنیا وردبوونەوە لە نیگاکانی، لە ماچکردنی ناوچەوانی ئەو ڕاستییە دەردەخات. بەڵام لەوە ناگا بۆ دایکی تەنیا وەک هاوڕێیەک سەیری ئەو دەکات. زۆر جار پرسیار لە خۆی دەکات و دەڵێ بڵێی دایکم هێندە باوکمی خۆشبوێ کە نەتوانێ جارێکی تر کەسێکی تری خۆشبوێ. دایکی بەردەوام بەڵێنی پێدەدا باسی باوکی بۆ بکات، بەڵام فریا نەکەوت.

هانس ئێستا دەزانێ دایکی بە ناوی باوکییەوە ناوی ناوە. ئەوەی بۆ باس کردووە باوکی سوێدییەو پزیشکێکی زۆر زیرەکە. چیرۆکی خۆشەویستی باوکی بۆ گێڕابووەوە. بەڵام هەرگیز باسی ئەوەی بۆ نەکرد، بۆچ وازییان لەیەک هێناوە. دایکی تا ئێستا نەیتوانیوە باوکی لەبیربکات. هانس لەگەڵ ئەوەی منداڵبوو، زۆر بیری لە دایکی دەکردەوە، دایکی بەشێوەیەکی سەیر ئەوی خۆشدەویست. هانس سەری سوڕدەما لە خۆشەویستیی بێ شوماری دایکی. تەنانەت زۆرجار کە دەچووە لای هاوڕێکانی بە وردی سەرنجی پەیوەندی دایکەکانی دەدا تا بزانێ ئەوان چۆن لەگەڵ منداڵەکانیاندا مامەڵەدەکەن. دایکێکی تری نەبینی وەک دایکی بەو جۆرە خۆشەویستی خۆی دەربڕی. هانس شانازی بەدایکییەوە دەکرد.
هەتاو لەبەرخاتری هانس حەزی دەکرد ڕۆحی بێتەوە جەستەی، لەگەڵ ئەوەی نەورۆز وەک باوکێکی دڵسۆز ئاگاداری هانس بوو. بەڵام هانس هیچ شەوێ بەبێ گریان خەوی لێنەدەکەوت. هەتاویش ئەمەی دەبینی، بەمەیش دڵگران دەبوو. دەیزانی هێشتا کاتی گەڕانەوەی ڕۆحی بۆ ناو جەستەی نەهاتووە. دڵیشی نایێت ئەو دوو ژنەی ئێستا لە گەڵیاندایە

بە جێیان بهێڵن. بەینی لەگەڵیاندا زۆر خۆشە و هەرسێکیان پێکەوە سەرگوزشتەی خۆیان بۆ یەکتر دەگێڕنەوە. هەتاو نازانێ چۆن لە ناو ئەم هەموو ڕۆحە وێڵانەدا ڕێی کەوتە بەر ئەم دووانە. ئۆلگا خەڵکی ڕووسیایە و سەمیرەش خەڵکی جەزائیرە. ئۆلگا بەردەوام هۆنراوەیان بۆ دەخوێنێتەوەو سەمیرەش گۆرانیان بۆ دەڵێ. ئەمیش نازانێ چییان بۆ بکات. کە گەنج بوو زۆر حەزی لە سەما بوو، زۆر جار کە کەس لە ماڵ نەبوو مۆسیقای ئومکەلسوومی دەخستە سەری و لەبەر ئاوێنەدا سەمای دەکرد. لە ستۆکهۆڵمیش ڕێزانی هاوڕێی زۆر حەزی لە سەمای ڕۆژهەڵاتی بوو، شارایش حەزی لە سەمای ڕۆژئاوایی دەکرد. زۆر جار لە تەنیاییەکاندا هەرسێکیان دەکەوتنە سەما بە شێوەی جیاوازجیاواز. بیر لەوەیش دەکاتەوە کە هەوڵ بدا لێرەوە بیاندۆزێتەوە. شارا دەبێت ڕۆحی لە سەرەوە بێت و ڕێزانیش هێشتا لە ژیاندا مابێ.

هەتاو دەستی کردە ملێ ئۆلگا و وتی «دەتوانی یارمەتیم بدەی دوو هاوڕێم بۆ بدۆزیتەوە، زۆر دەمێکە ئاگام لێیان نەماوە«. «پەلەت نەبێت ئەو کارەیش دەکەین، دەزانم زۆر بیریان دەکەیت، دڵنیا بە لەوەی کەسانی خۆشەویست هەرگیز لە بیر ناکرێن، ئیتر هەر کەسێک بێت، لەوەیش دڵنیات دەکەمەوە، پاش مردنیش ڕۆحی ئەو کەسانەی کە لەم دنیا یەکترییان خۆش ویستووە بە یەک دەگەیێنەوە و یەکتر دەدۆزنەوە«. هەتاو زۆر حەزی لە هۆنراوەکانی ئۆلگا بوو. زۆر جار لە هۆنراوەکانیدا خۆی دەدۆزییەوە. وشەی هۆنراوەکانی دەگەیێنە دڵی هەموومان. ئۆلگایش ئەمەی زۆر پێ خۆشبوو. ئەو هەموو شیعرەکانی خۆیی لەبەرە و یەک وشەیش چییە لە بیری نەکردوە. ئەم پارچە شیعرەی بۆ خوێندەوە:

ئەو ساتانەی بڕیار دەدەم لە بیرت کەم،

لەهەموو کاتێ زیاتر داگیرم دەکەی.
ئەو ساتانەی دەمەوێ ڕەنگت لە سەر تابلۆی ژینمدا بسڕمەوە،
ڕەنگت لە هەموو جارێ زیاتر دەبێتە مۆزایکی دڵم.
ئەو ساتەی بڕیار دەدەم گوێ لە دەنگت نەگرم
کەچی لە دەنگی تۆ زیاتر گوێم لە هیچ دەنگێکی تر نابێت.

ئەمە چ شەپۆلێکە بەبێ شەرم،
بەرەو قوڵایی سەرابم دەبات.
ئەمە چ شنەیەکە،
لە شەرابەکەی خەیام زیاتر سەرمەستم دەکات.
ئەمە چ سەرشێتییەکە،
لە ئامێزی سیمفۆنیای خەمدا دەمسوتێنێ.
ئەمە چ ڕۆحێکە.
وەک ئەسپێکی کێویی بێ ئۆقرە دەمفڕێنێ
سوپاس بۆ ئەو دڵەی فێری خۆشەویستیی کردم،
سوپاس بۆ ئەو لێوەی فێری ماچی کردم.
سوپاس بۆ ئەو ئامێزەی مانای گەرمیی پێ بەخشیم.
سوپاس بۆ ئەو پیاوەی بووە دەزووی کۆلارەی چاوم.

دڵم دەکەمە گوڵاڵەیەک و لەبەردەم پەیکەری
دڵدارییەکی جوانەمەرگدا دایدەنێم.
ڕۆحیشم وەک باڵندەیەکی ئازادکراو بەرەو کەشکەڵانی ئاسمان دەفڕێنم
لە ناو جۆلانەی وشەکانی پۆشکیندا ئارام دەگرم.

من ئێستا بەسەر باڵی تۆوە خەوتووم.
لە خەومدا چرۆ دەگرم،
چرۆکانم دەبنە چرا و ڕێگای لووتکەم نیشان دەدەن.
چرۆکانم دەبنە گۆرانی و مانای بوونم پێ دەبەخشن.
من ئێستا دەزانم بۆ گریان و پێکەنین هەن.
من ئێستا بەسەر باڵی پەپوولەیەکەوەم و
لە هەزاران میل دوورترەوە گوێم لە ئاوازی هەناسەتە و
چاوم لە هەنگاوی بەر بارانتە.
من ئێستا لەسەر پەڕی گوڵێ،
ماڵم بۆ خۆم دروست کردووە.
تۆیش وەک چەپکێ ڕووناکی،
دەبێتە میوانی ساتە خامۆشەکانم.
هەر کاتێ هاتی و لە دەرگات دا و لە ماڵدا نەبووم
بزانە لە خەڵوەتی عەشقێکی سەرگەرداندا نقوم بووم.
تکایە ئەمجارەیان بە دوامدا مەگەڕێ
بەنیازم کۆچ بکەم، ڕێگای عەدەم بگرمە بەر
چونکە ئەم زەمینە بە وڵاتی خۆم نازانم
لە ئامێزیدا هەست بە نامۆیی دەکەم
لە ئامێزتدا هەست بە دڵنیایی ناکەم
من بڕیارم دا بە یەکجاری جێت بهێڵم.
تکایە! جارێکی دی مەبە میوانی سەکۆی دڵم.
تکایە ڕووی نیگاکانت وەرگێڕە و
کۆشکی هۆشم مەڕووخێنە.

ژیانی ئۆڵگایش پڕبوو لە ڕووداوی سەیر. ئۆڵگا لە تەمەنی پەنجاوپێنج

ساڵاندا ژیانی سەر زەمین جێ دەهێڵێ. هەر خۆیشی ئەو بڕیارە دەدا. ئۆلگا لە تەمەنی پەنجاوچوار ساڵاندا بۆ یەکەمین جار دەکەوێتە خۆشەویستی پیاوێکەوە کە گەلێک ساڵ لەمەوبەر لە کۆلێژدا یەکتریبان ناسیوە. هەروا دەزانێ کاتێ ئەوان پێکەوە لە کۆلێژ دەیانخوێند، ئەو ئەمی خۆش ویستووە. ئەم تەنیا وەک کوڕە هاوڕێیەک تەماشای کردووە. ئێستایش پێی سەیرە خۆشەویستییەکی سی ساڵە، دەروونیی جێ نەهێشتووە و وەک سێبەر بە دوایەوە بووە. ئۆلگا لەبەرئەوەی تا ئەو ساتە خۆشەویستی نەکردبوو نەیدەزانی خۆشەویستی یەک لایەنە چ ئازارێک بە دەروون دەگەیێنێ. لە دڵەوە بەزەیی پێیدا دەهاتەوە، حەزی دەکرد کارێکی بۆ بکات، تا ئازاری ئەو هەموو ساڵانەی بۆ بسڕێتەوە. هەڵبەت خۆ خەتای ئەم نەبوو. ئەو هێندە ئازایەتی لە خۆیدا شک نەبردووە تا نهێنی خۆشەویستییەکەی خۆیی بۆ بدرکێنێ. هەتاو سەری دەخستە سەر ڕانی ئۆلگا و دەیگوت «دەی باسی چیرۆکەکانی خۆتم بۆ بکە، بۆ دەتەوێ خۆت لابدەی لەو مەسەلەیە. خۆ من لای کەس باسی ناکەم.» ئۆلگا بە پێکەنینەوە دەیگوت «من خۆیشم لە خۆم ناگەم، بۆ من خۆم گێل دەکرد لەو کەسانەی خۆشیان دەویستم، بوارم بە کەس نەدەدا هەستیان بەرامبەرم دەرببڕن، لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت، من وەک شاعیرێک بەردەوام لە ناو پیاواندا ئامادەگیم هەبوو، هاوڕێکانم هەموو پیاو بوون. دەترسام لەوەی گەر هەستەکانم بەڕەڵا بکەم و کەسێکیانم خۆش بوێت ئیتر ئەوانی ترم لە دەست بچێت. من بەردەوام حەزم لە مەجلیسی پیاوان بووە. ئەوانیش بەردەوام گەرمی و خۆشەویستییان بە من دەبەخشی. ئێستا دەزانم بۆ نەمدەویست کەسێکم خۆش بوێ، چونکە دەترسام لەوەی ژیانی هاوبەش لەگەڵ یەکێکیاندا دەست پێ بکەم، ئەوا خۆشەویستی و گەرمییەکەی ئەوانی ترم لە دەست بڕوات. نامەوێ بە هەڵە لێم تێبگەی، چونکە من هەتا

ئێستا له خۆم نهگهییشتووم، نازانم بۆ ههرگیز پێویستیم به تێکهڵی جهستهیی نهبوو، من ههرگیز ئاماده نهبووم ڕێگه به یهکێکیان بدهم له ئامێزم بگرن یان ماچێکم بکهن. جیا له ههموو کچه ڕووسهکان. وامدهزانی گهر ئهو پهیوهندییه گهییشته ماچ و دهستبازی ئهوا ئهوانی ترم وهک هاوڕێیهک له دهست دهچێت. لهوانهیه کهسیش بڕوای بهم ڕاستیه نهبووبێت.»

ئۆلگا ڕاست دهکات، لهوانهیه ئێوهیش بڕوای پێ نهکهن، ژنێکی ڕووس بهو ههموو جوانییهوه ئاماده نهبێت له ئامێزی یهکێ لهو پیاوانهی که خۆشیان دهوێ ئارام بگرێ. ئۆلگا نهک تهنیا ژنێکی ناسک و خوێنشیرین بوو، بهڵکوو که سهیری چاوه زهرده بریسکهدارهکانیت دهکرد جوانییهکی سهیری ڕۆحیت دهبینی. ئهو وهک پارچهیهک له خۆشهویستی بوو، که لهگهڵیدا دادهنیشتی ههستت بهو سۆزهی دهکرد. لهوانهیه ههربۆیه پیاوان ههنده حهزیان به تێکهڵبوونی بووبێت. لهناو یهکێ لهو کتێبانهی که پێش کۆچی دهیخوێندهوه، چهند لاپهڕهیهکی به جێ هێشتبوو که پێش مانگێ نووسیبووی. ئهمهیش دهقهکه ههموویهتی:

ئهمشهو وهک بوودا به دوای دارههنجیرێکدا دهگهڕام، تا له ژێریدا دانیشم و بکهومه خهڵوهتهوه و به دوای وهڵامی پرسیاره شاراوهکانی خۆمدا بگهڕیم. نه دار ههنجیرم دۆزییهوه نهیش توانیم بکهومه خهڵوهتهوه، زۆرساتیش ئاواتهخوازبووم بکهومه دوا خهڵوهتی مردنهوه. من پێشتر ههرگیز بیرم له مردن نهدهکردهوه، ههموو ئهو شتانهی که ژنێک خهوی پێوه دهبینی من ههمبوو، مێردێ ههموو پێداویستییهکانی بۆ جێبهجێ دهکردم. له گرانترین شوێنی ڕۆمادا خانوویێکی خۆشم ههبوو، ژوورێکی تایبهتیم بۆ نووسین ههبوو، که دهیڕوانییه سهر باخچهیهکی گهورهی پڕ له گوڵ. پێکهوه زۆربهی وڵاتانی جیهان گهڕاین. گهر بڵێم بهختهوهر

بووم ئەوا درۆ لەگەڵ خۆمدا دەکەم. من نەمتوانی منداڵم ببێ، ئەویش پاش چەند ساڵێ لە ژیانی ژنومێردایەتی، لە سەفەرێکدا سەیارەکەی وەرگەڕاو لە ئەنجامی ئەو ڕووداوەدا پیاوەتییەکەی لە کیسی چوو. ئەو بە هەموو شێوەیەک دەیویست جۆشوخرۆشە سێکسییەکانی من پڕ بکاتەوە. ئەو ساتانە تەواو شەرمەزاری دەبووم. ئەو ترسی ئەوەی هەبوو دوای پیاوانی تر بکەوم. من دەمزانی ئەو منی زۆر خۆش دەوێت. بەڵام لەوە ناگەم بۆ ئەو هەستە لە دەروونمدا دروست نەبوو. من ئەوم وەک مرۆڤێک خۆش دەویست نەک وەک پیاوێ کە عاشقی بووبێتم. پاش ماوەیەک بۆی دەرکەوت من ژنێکی ئەمەکدارم و بۆ سێکس هەرگیز ئەو ناگۆڕمەوە بە پیاوانی تر. ئەو زیاتر و زیاتر منی خۆش دەویست، بە دیاریی گران گران شەرمەزاری کردبووم. دیوانە شیعرەکانمی دەبردە لای باشترین دەزگای چاپ و بە گرانترین شێوە چاپی دەکرد. لەگەڵ ئەوەی هەرگیز بەباشی فێری ڕووسی نەبوو تا بتوانێ شیعرەکانم بخوێنێتەوە. خۆم بە ئیتالیاییەکی شەقوشڕ ناوەڕۆکی شیعرەکانمم باس دەکرد بۆی. لە شاری مۆسکۆ خانوویێکی گەورەی بۆ کڕیم کە دەیڕوانییە سەر مەیدانی سوور. ئەو شوێنەی هەردەم خەوم پێیەوە دەبینی لێی بژیم. ئەو هەستی دەکرد من وەک گوڵێکی بێ ئاو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ سیس دەبم. بۆیە زۆرجار داوای لێ دەکردم بە جێی بهێڵم و ژیانێکی تر دەست پێ بکەم. یەکێ لەو ئێوارانەی کە ئیگۆرم بینی و گەڕامەوە ماڵەوە هەستی بە گۆڕانکارییەک کرد لە ڕۆحمدا. ئیگۆر چەند جارێ هاتە ڕۆما و یەکتریمان بینی، هەر کاتێکیش من دەچوومەوە هەلیکمان دەدۆزییەوە یەکترمان دەبینی. ئێوارەیەک کە گەڕامەوە بینیم نامەیەکی بۆ بە جێ هێشتبووم، تێیدا نووسیبوو، ئەو سەفەر دەکات و دەیەوێت هەتا ئەو دەگەڕێتەوە من بۆ یەکجاری سەفەر بکەم، و چەکێکی پارەی بۆ بە جێ هێشتبووم. چەکەکەم بۆی

بە جێ هێشت، بەڵام پاشتر خستیە سەر حیسابەکەم. ڕاستە ئەو بیست ساڵ لە من گەورەتر بوو، بەڵام من هەرگیز نەمدەهێشت ئەو هەست بەو جیاوازییە بکات. کە ئەوم جێ هێشت هەستم کرد ئەو پیاوە چ بۆشاییەکی لە ژیانی مندا بە جێ هێشت. من عاشقی نەبووم و ئەو خۆیشی دەیزانی و زۆرجاریش پێی دەوتم گەر عاشق بووی جێم بهێڵە. یەکەمین جار من لە ڕۆما ئیگۆرم بینی عاشقی نەبووم، پێکەوە نانی ئێوارەمان خوارد، پێکەوە چەند سەعاتێک لەناو شاری ڕۆمادا پیاسەمان کرد. پاشان گەیاندمە هوتێلەکە و ئەملاوئەولایم ماچ کرد و جێیم هێشت. دەمزانی زۆر حەزی دەکرد لەگەڵیدا بچمە ژوورەوە. لە چاوەکانیدا ئەو ڕاستییەم دەبینی بەڵام خۆمم لێی گێل کرد. کە سەیری چاوەکانیم دەکرد خەریک بوو بە ساغی قووتم بدات، خۆیشمم لە نیگاکانی گێل کرد و ڕێگای ماڵەوەم گرتە بەر. هەموو جارێ کە یەکتریمان دەبینی، هەموو شتەکان دووبارە دەبوویەوە. جارێکیان ماڵئاوایم لێی کرد و ڕۆییشتم، پاش چەند هەنگاوێ لایەکم لێی کردەوە و بینیم لە شوێنەکەی خۆیدا وەستاوە و چاوی بڕیوەتە هەنگاوەکانم. هێزێ وەک موقناتیس بەرەو ئەوی ڕایکێشام. بە ڕاکردن بەرەو ڕووی چووم. وەک منداڵێکی بچووک خۆمم هەڵدایە باوەشیەوە. توند یەکترمان لە ئامێز گرت و تەنیا ماچی یەکترمان دەکرد. پاشان لەگەڵیدا چوومە ژوورەکەیەوە. وابزانم ئەوە یەکەم دوا شەو بوو بۆ من، خۆمم تێیدا دۆزییەوە، هەستم کرد، ئەم هەموو ساڵەی تەمەنم بە زایە چووە. ئەو خۆشییەی لەگەڵ ئەودا هەستم پێی کرد، لەماوەی تەمەنمدا هەستم پێی نەکردبوو. لە مانای تێکەڵ بوونی ڕۆح و جەستە گەیشتم. من هەموو تەمەنم بەدوای ئەو تێکەڵبوونەدا دەگەڕام. بۆم دەرکەوت هەموو ئەو خۆشییانەی ناوم نابوو خۆشی و بەختەوەری هەمووی هەر خۆهەڵخەڵەتاندن بوون. ئەو تێکەڵبوونە درەوشانەوەی ڕۆحی پێ بەخشیم. لەگەڵ ئەوەیشدا

ئەو شەوە گەڕامەوە لای مێردەکەم. ئەوە دوا ئێوارەیەک بوو پێکەوە نانمان خوارد. پێی ڕاگەیاندم کە سبەی سەفەر دەکات. منیش وەک هەموو جارێ جلەکانم بۆی ئامادە کرد و سەرم خستە سەرشانی تا خەو بردمیەوە. ئەوە دواجاربوو لەسەر شانی ئەو خەوم لێ کەوت. ڕۆژێ پاش سەفەرەکەی، شتەکانم کۆ کردەوە و گەڕامەوە مۆسکۆ. نەمزانی چی وای لێ کردم وا بە ئاسانی ژیانە هاوبەشەکەم لەگەڵ ئەو پیاوەی وەک باوک و برا و کوڕ و مێرد خزمەتی دەکردم کۆتایی پێ بهێنم. لەوانەیە تێکەڵبوونی ڕۆحم لەگەڵ ڕۆحی ئیگۆر بێت. گەڕامەوە بەڵام هەستم بە سەرگەردانییەکی سەیر دەکرد. ڕووداوەکانی ئەو چەند ساڵەم هەموو تێکەڵ و پێکەڵبوون. زۆرجار خۆم بە فریشتەیەکی خۆشەویستی و زۆرجاریش خۆم بە بوونێکی بێدڵ دیتە پێش چاو. لەیەک ساتدا و بە یەک ڕستە هەموو ئەو شتانەی نەمدەویست بیانبینم یان دانیان پێدا بنێم، هەمووی هاتە پێش چاوم. بیریشم بوو بە هەورێکی قورس؛ داباری و جەستەمی شۆردەوە، ڕەشاییەکەی برژانگەکانم بە سەر ڕوومەتە سوورکراوەکەمدا هاتەخوارەوە. دەموچاوم بێ ماکیاج مایەوە، ژیانم پەردەی لە سەر ڕابردووم لا دایەوە. کاتی ئەوە هاتبوو ئەو شتانەی کە نەمبینیبوون لەو ساتە سەختەدا هەموویان ببینیم.

پاش ماوەیەک لە هاتنەوەم بۆ مۆسکۆ، هاوڕێیەکم پەیوەندیی پێوە کردم، من ئەوم بیر نەدەهاتەوە. کە قسەی لەگەڵ کردم باسی هەندێ شتی بۆ کردم ئەوجا ڕووداوەکان و شێوەیم هاتەوە پێش چاو. هەفتەیەک بوو بەردەوام تەلەفۆنی دەکرد و دەیویست لە ئاهەنگی گوێزەبانەی پەنجا ساڵانیدا ئامادە ببم. نینای ژنیشی حەز دەکات بمناسێ.
چەپکە گوڵەکەم دا پێی و لە ئامێزیم گرت. پاشان نینای ژنیشیم لە ئامێز گرت. ڕووی کردە نینا و وتی: ئەمە ئەو کەسەیە کە هەردەم خۆشیم

ویستووه و کەسیشم وەک ئەو خۆش نەویستووە، خۆت دەزانی ئەمە شازادەی خەونەکانم بوو، بۆم باس کردووی، دەزانی. ئەو هەر بەردەوام بوو لە قسەکردن و منیش ڕوومەتەکانم هێندەی تر سوور دەبوونەوە. بە نینام وت ببوورە دیارە زۆری خواردووەتەوە. ئەویش بە بزەیەکەوە کە دەربڕی خەمێکی قووڵ بوو، وتی خۆت تێک مەدە من ئاگادارم. هەردووکمان هەردوو باڵیمان گرت و بردمانە ژوورێکی ترەوە. لەناکاوا فرمێسک سەرتاپای گیانمی داپۆشی. ببوورە، داوای لێبووردنت لێ دەکەم، گەر هێندە ئازارت بە هۆی منەوە چەشتبێ. بە پێکەنینەوە وتی: بیرتە، خۆت ڕازی بووی ببیتە شازادەی خەونەکانم.

بیرم کەوتەوە، زۆرجار کە لە کۆڕە شیعرێک دەبووینەوە، بیانوویەکی دەدۆزییەوە بۆ ئەوەی بە تەکسی بمگەیێنێ. هەموو جار دەرگای تەکسیەکەی بۆ دەکردمەوە و دەیوت فەرموو شازادەکەم. جارێک پێیم وت من شازادەی تۆ نیم. وتی ئەی باشە ڕازی دەبی ببیتە شازادەی خەونەکانم، وتم: ئەوەیانم قبووڵە. ئەی ڕازی دەبی لە خەونەکانمدا ماچت بکەم. لایەکم بۆ کردەوە و وتم: وس بە سەرسەری. ئەمجارەیان گەر قسەی وا بکەیت لە گەڵتدا سواری تەکسی نابم. ئیتر لە ماوەی ئەو ساڵەدا کە دوا ساڵی من بوو لە مۆسکۆ، بووم بە شازادەی خەونەکانی. نازانم چۆن لە ماوەی چەند ساتێکی کورتدا کۆمەڵە کورتەفلیمێک کەوتنە سەر گۆنای فرمێسکەکانم. هەروا کورە هونەرمەندەکەم کەوتەوە یاد، ئەو شیعرانەی من دەمخوێندەوە لە ئێوارەکۆڕەکاندا دەبووە ئیلهامی تابلۆکانی. من دەمزانی ئەو بە بینیی من ڕۆحی تێکەڵ بە ڕووناکی دەبێت، بەڵام وام دەزانی ئەو عاشقی وشەکانی منە و شیعرەکانم سەرچاوەی ئیلهامی ئەون. ئەو ئێوارەیەی بڕیارم دا مۆسکۆ جێ بهێڵم و دوای پیاوێکی ئیتالیایی بکەوم کە تەنیا چوار ڕۆژ لەگەڵیدا

بووم، چوومە لای و پێیم وت من دەڕۆم، دەڕۆم بۆ ئیتالیا، دەیزانی من عاشقی ئیتالیا و زمانی ئیتالیاییم، دەیزانی چۆن خۆم فێری ئەو زمانە کرد، ژیان لە ئیتالیا بۆ من خەوێک بوو. بەڵێنم پێی دا کە گەیشتمە ئەوێ بانگهێشتی بکەم و هەموو مۆزەخانە و پێشەنگاکانی بگێڕم. بەڵێنم پێی دا شیعرە تازەکانمی بۆ بنێرم. بەداخەوە هیچ یەکێ لەو بەڵێنانەم بە جێ نەگەیاند. پاش ساتێ وەک منداڵێک دەستی کرد بە گریان و هەنسکی دەدا. داوای لێ کردم ئەو کارە نەکەم و هاوڕێ و ئازیزان و ئێوارە شیعرییەکانم جێ نەهێڵم. ڕاستە من تاقە کەس نەبووم لەو ئێوارەگەلەدا شیعرم دەخوێندەوە بەڵام من ڕۆڵێکی سەرەکیم هەبوو لە کۆکردنەوەی هەموویان و زۆرجاریش هەموویانم دەبردە خانووەکەی باوکم کە لەدەرەوەی مۆسکۆدا بوو.

سەیرێکی کردم و بە بزەیەکەوە وتی «ئەوە ساڵێکە دەمەوێ تابلۆیەکی تۆ بکێشم، هەر بوارت نەبوو، بەنیاز بووم ئەمساڵ ئەو کارە بکەم، وەک دیاریی دەرچوونت لە کۆلێژ بتدەمێ. چۆن کاری وا دەکەیت تەنیا یەک ساڵت ماوە.»منیش بە پێکەنینەوە وتم «ها ئەوە وێنەیەکی خۆم». «نا وێنەم ناوێ، خۆتم بە زیندوویی دەوێ». فرمێسکەکانی تێکەڵ بە ڕیش و سمێڵە درێژەکەی بوو. ئێستا و لێرەوە، ئاوڕ لە ڕابوردووم دەدەمەوە، دەڵێم چەند دڵڕەق بووم، خۆ دەمتوانی سەری بخەمە سەر شانم، هیچ نەبووایە بەسەر شانی مندا بگریایە. پاش چەند ساڵێ زانیم ئەو هاوڕێیەم بە شێوەیەکی تەماوی مردووە. نەچووم گوڵێ لەسەر گۆڕەکەی دانێم. خۆشم نازانم ئەم هەموو شیعرانەی لەسەر خۆشەویستی دەینووسم، لە کوێوە سەرچاوە هەڵدەگرن!

ئەو شتانەی کە هەرگیز بیرم نەدەکەوتنەوە. پانتایی هۆشمیان داگیر

کرد. فرمێسکەکان تا دەهات بەخوڕتر دەبوون. سەری بەرزکردەوە و وتی «مەگری تکایە مەگری. نینا مەهێڵە بگرییێت. تەواو هیچ ناڵێم. دەچینەوە لای خەڵکەکە.»دەمووچاوێکمان شۆرد. ئەوجا چووینەوە دانیشتین.

ئەو کات نەمدەزانی ئەوە چ هێزێکە لە دەروونـدا دروست دەبێت و هەموو ئەو ئازارە لەگەڵ خۆیدا بۆ ژیان دەهێنێ. پاش ئەو ئاهەنگە گەڕامەوە و خۆمم خزانە ناو جێگەکەم. لەناو جێگەکەمدا بیرم لە خۆم دەکـردەوە، من چیم؟ من کێم؟ من هەرگیز نامەوێ ئازاری کەسێک بدەم، من هەرگیز نەمویستووە دڵی کەسێک بشکێنم. بەڵام بەبێ ئەوەی زانیبێتم ئازاری ئەو کەسانەم داوە کە منیان خۆش ویستووە، دواییش دەڵێم خۆ زۆربەی ئەو کەسانە ڕاست و بێ پەردە بە منیان نەوتووە کە خۆشیان دەوێم. ئەوان ئەو ڕاستییەیان لام نەدرکاندووە. دواییش دەڵێم منێک هەردەم لە وشە زیاتر هیچی ترم بە لاوە گرنگ نەبووە، من تەنیا شەیدای شیعر و کتێبەکانم بووم، ئەوانیش ئەوەیان دەبینی بۆیە کەسیان نەیاندەوێرا نیازی دڵیان بە لامەوە بدرکێنن.

ئەی ئێستا خۆم چیم. ئێستا کە دەچمە دڵمەوە هەست دەکەم چرۆیەکی خۆشەویستی بە پیرەدارە ئەرخەوانییەکەی دڵمەوەیە، نازانم وەرزەکەی پاییزە و ئەو چرۆیە دەوەرێ یان دەبێتە گوڵێکی ئەرخەوانی. کە دەچمە ناو دڵمەوە ڕووناکاییەکەی مۆمێک دەبینم، نازانم لەو شەوە تاریکەدا بایەک هەڵدەکات و دەیکوژێنێتەوە یان تا دواهەناسە دڵم ڕووناک دەکاتەوە.

هـەتـاو! گوێت لێمە، ئـەوە بـۆ کـوێ فـڕیـوی؟ خـۆت داوات لێکردم

سەرگوزشتەی ژیانمت بۆ بگێڕمەوە. ئا بیرم کەوتەوە دەبێت لە کوێوە دەست پێبکەم. هاتمەوە بۆ مۆسکۆ. پێش هەموو شتێ بیرم لەوە کردەوە ئیگۆر بدۆزمەوە. دەمزانی دەبێت یەکتر ببینینەوە، دەمزانی ئەمە دواجاری تێکەڵاویمان نابێت. ئەو هەموو جارەی یەکتریمان بینی کەسمان باسی ژیانی تایبەتی خۆمانمان نەدەکرد. ئەو دەیزانی من هەر لەگەڵ مێردەکەمدا دەژییتم. بەڵام من هیچم لەسەر ژیانی ئەو نەدەزانی. تەنانەت ئەوەشم لەیادچوو بپرسم کە ژنی هەیە یان نا. پەیوەندیم لەگەڵدا کرد. ئەو بەمە زۆر دڵخۆش بوو. لەوە نەگەیشت بۆ من وا زوو گەڕامەوە بۆ مۆسکۆ. بۆ ئێوارەی داهاتوو پێکەوە نانمان خوارد. هەردووکمان باسی زۆر شتمان کرد. هەردووکمان دەمانویست لە باس کردنی ئەو شەوە خۆمان دوور خەینەوە. بەڵام زیاتر و زیاتر هەستم دەکرد ئەو پیاوە منی خۆش دەوێت و ئەو خۆشەویستییە وەک گڕێک لە دەروونیدا دەسووتێ. لە من زیاتر کەسێکی تر نابینێ. لەم هەموو خەڵکەی بەدەورماندایە لە دەموچاوی من زیاتر دەموچاوێکی تر نابینێ. بێ ئەوەی ئاگامان لەخۆمان بێت دوو شووشە شەرابی سوورمان خواردەوە. دەنگی پێکەنینمان ئەوانەی دووروبەرمانی بێزارکردبوو. هەربۆیە پاش نانخواردنەکە خێرا هەستاین و پیاسەیەکی ناو شارمان کرد. لە ساتێکدا هەستم کرد ئەو پیاوە، منی لە خۆی خۆشتر دەوێت. لەیەکێ لە شەقامەکان پەڕینەوە، من گوێم نەدایە ڕەنگی سوورەکە و ویستم بپەڕمەوە، یەکسەر دەستی گرتم و هاتە لای چەپم، گەر سەیارەیەک بهاتایە لەلای چەپەوە دەهات. گەر سەیارەیەک لەپڕ بهاتایە لەوی دەدا نەک لە من. منی گەیاندە ماڵەوە و ئەملاوئەولایم ماچ کرد. ماوەیەک چاوەڕوانی کرد تا من چوومە ژوورەوە. دەمزانی لە دڵەوە دەیویست پێی بڵێم فەرموو وەرە ژوورەوە. من هەرگیز ئەوەم نەوت لەگەڵ ئەوەی من ئەو ساتە ئازادبووم و لە لەزەتی

تێکەڵبوون لەگەڵیدا تێگەیشتبووم. لە ماوەی ئەو دوو مانگەدا چەند جارێ پێکەوە دەرچووین. لە هەموو چوونە دەرەوەیەکدا کۆمەڵێ هێمام دەبینی، نازانم گەر بەمەبەست خۆی لەدەوری ئەو هێمایانە دەگرتەوە یان هێنانەوەیەکی مندالانە بوو. چونکە زۆرجار وەک منداڵێک دەهاتە پێش چاوم و دەمویست لە ئامێزی بگرم . ئێوارەیەک چووینە دەرەوەی شار، لە ڕێستورانێکی بچووکی ناو دارستانێکدا دانیشتین، ئەمجارەیان شووشەیەک ڤۆدگامان تەواوکرد. هەردووکمان پێکەوە باش سەرخۆشبووین، قسەی زۆرمانکرد. زۆر پێکەنیین، شەوو ڕۆژمان لێک جیانەدەکردەوە. دەمەو بەیانی بوو هەردووکمان خەبەرمان بوویەوە. لە ئامێزی یەکتردا لە ژێر دارێکدا خەومان لێکەوتبوو. کەسمان نەمانزانی چۆن لە ژێر ئەو دارەدا خەومان لێکەوتووە. ئەی چۆن سەرمامان نەبووە. تەماشایەکی یەکترمان کرد و دامانە قاقای پێکەنیین. یەکترمان لە ئامێزگرتووەو ئەوەندە توند جەستەمی بە جەستەیەوە نووساند، سنووری نێوان هەردوو جەستەمان بۆ یەکجاری سڕایەوە. ئەمجا هەستاو دەستی گرتم تا هەستمەوە. بە قەدی دارەکەیەوە نووساندم. وتی: تۆ قەد و من لق، تۆ ڕەگ و من خاک، تۆ خونچە و من گەڵا. منی ڕاکێشایە ئامێزییەوە وتی: وا مەزانە تەنیا تۆ دەتوانی شیعر بۆ خۆشەویستی بنووسی. خستە سەرشانم و لێم نزیکبوویەوەو ماچێکی سەری کردم. سەیارەکەیمان دۆزییەوە منی گەیاندە ماڵەوە. لەوە نەدەگەیشتم بۆ ئەو شەوە دووبارە نابێتەوە. بۆ وەک ئەو شەوە خۆم فڕێ نادەمە باوەشییەوە، بۆ پێی نالێم کە لەگەڵمدا بێتە ماڵەوە، بۆ هەر لە دەرەوە یەکتر دەبینین. ئەی بۆ ئەو دەستپێشخەری ناکات لەوەی وەک ئەو شەوە ڕامکێشتە باوەشیەوە. پارچە بە پارچەی جلەکانم لەبەرداکەنێ و هەموو جەستەم ماچباران بکات. بۆ دەبێت دڵم ئازاد نەکەم و وەک مەلێک بەرەو ئاسمانی خۆشەویستی بفڕێ. من بەردەوام

شیعر لەسەر خۆشەویستییەک دەنووسم کە نەمزانییوە تام و ڕەنگی ئەو خۆشەویستییە چییە. دوایی بیرم لەوە دەکردەوە باشە ئەم پیاوە هەرگیز باسی ئەوە ناکات وا منی خۆشدەوێت. من تەنیا خۆشەویستی لە نیگاو هەڵسوکەوتیدا دەبینم. تێکەڵبوونی ئەو شەوەمان تەنیاو تەنیا هێمای خۆشەویستی بوو. لەگەڵ ئەوەی هەرگیز بەمنی نەوت خۆشی دەوێم. لەوانەشە بیەوێت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دڵم داگیربکات و ئەوجا پێم بڵێ خۆشی دەوێم.

ئێوارەیەکیان لە قاوەخانەیەکدا دانیشتبووین، هاوڕییەکی کاتی زانکۆمان بینی. کە هەردووکمانی بینی، سەری سورماو ڕووی کردە ئیگۆر و وتی «خەوەکەت هاتە دی، وا ئێستا بەرامبەر ئۆلگا دانیشتووی، بۆت باس کرد چۆن پاش چوونی بۆ ئیتالیا نەخۆش کەوتی و وازت لە کۆلێژ هێنا. پاشان ڕووی لە من کرد و پرسی ئەی ناتاشاو منداڵەکان چۆنن؟.»تێگەیشتم ئەوە پرسیار نەبوو بەڵکو ئاگاداری بوو بۆ من. لەگەڵ ئەوەی زانیم ئیگۆر ژنی هەیە بەڵام ئەو ئێوارەیە داوام لێی کرد لەگەڵمدا بێتەوە. ماڵەکەم پڕبوو لە شەرابی ئیتالی. هەردووکمان خواردمانەوە. جارە جارە دەستی دەهێنا بەسەرمدا، دەستی دەخستە ناو قژمەوە، پاشان ڕایکێشامە ناو ئامێزییەوە، منیش هیچ بەرگریم نەکرد. تەماشایەکم کرد و وتم»دەزانم چەندت خۆشدەوێم، وا هەستیش دەکەم کەسێک نەبووە هێندەی تۆ منی خۆش ویستبێ. دەزانی زۆرجار ناوێرم تەماشای نیگاکانت بکەم.»پێکەنی و چاوەکانی نوقاند. چاوەکانم ماچکرد و چوومە ئامێزییەوە. هێندە توند لە ئامێزی گرتم خۆشم نەمزانی چۆن لەناویدا توامەوە. ئەو کاتەی کە لەئامێزیدا بووم، ئاگرێک لە دەروونمدا هەڵیکرد و ئیتر زانیم چۆن ئاگری خۆشەویستی دڵ دەسووتێنێ. ئەو هەستەی تەمەنێکە بە دوایدا وێڵم، وا دۆزیمەوە. هەستیشم دەکرد

ئەو ئاگرە بەرەو سووتانم دەبات. چونکە هەر جارەی کە دەچوومە ئامێزییەوە ڕەنگێکی ترم دەبینی، ئاوازێکی نوێ دەهاتە بەرگوێم. ئێستاش نازانم ئەمە خۆشەویستی بوو، یان هەنگاوێک بوو بەرەو مردن. من هەتا ئەم ساتەش ئەو هاوکێشەیەم پێ چارەسەرنەکرا. وەک ئەوانەی لە بیرکارییدا خراپن و بێ ئەوەی پرسیاری تاقیکردنەوەکان بزانن ترسی دەرنەچوون لە دڵیاندا دروست دەبێت. منیش هەروا نەمدەویست بیر لە سەرەتاو کۆتایی ئەو پرۆسەیە بکەمەوە. ئەو شەوە دیسانەوە گەیشتمە لووتکەو نەمدەویست بێمە خوارەوە. نەمدەویست جەستەم لە جەستەی بێتەوە، نەمدەویست لێوم لە لێوی بێتەوە. وەک لاولاو خۆمم لێ ئاڵاندبوو. ئەو شەوە ڕۆحم بەسەر لووتکەیەکەوە بوو، دەیڕوانیە سەر بەرزترین لووتکەی هیمالایا. بە داخەوە ئەمەش یاسای ژیانە کەس ناتوانێ تاسەر جێگای سەرلووتکە بێت. ئەو شەوە لەلام نەمایەوە. ئەو ڕۆیشت و منیش تێرگریام، تا بەیانی گریام. ناتاشام بیرکەوتەوە، ژنەکەی ئەو ناوی ناتاشایەو منداڵی هەیە. لە ناکاوا ڕەشەبای تووڕەیی هەڵیکرد و گڕمۆڵەی کردم. ئەو دەزانێ خۆی ژنی هەیە، بۆ ڕێگەی بەهەستەکانی دا من داگیر بکات. ئەو دەیزانی ئەو ناتوانێ بۆ من ببێت، ئەی بۆ بەرگی پەمەیی لەبەرکردم. ئەی بۆ من ئەوم خۆش ویست کاتێ پیاوێکی دی لە ژیانمدا هەبوو. ئەی بۆ من خۆمم خستە ئامێزییەوە کاتێ زانیم ئەو ژنی هەیە. ئەو شەوەو چەندان شەوی تر خەوم لێنەدەکەوت و دەمەو بەیانیان بەگریانەوە خەودەیبردمەوە. گەلێ بڕیارم دا زۆریانم جێبەجێ نەدەکرد. ڕۆژێک بڕیارم دا خاڵێ بۆ ئەو پەیوەندییە دابنێم. ماوەیەک وەڵامی تەلەفۆنەکەیم نەدایەوە. خۆم نیشان نەدەدا. بەشەوان گڵۆپم دانەدەگیرساند، بەدیار مۆمێکی کزەوە دادەنیشتم و وەک مۆمەکە دەتوامەوە. جارجارەش لە درزی پەردەکەوە تەماشایەکی خوارەوەم دەکرد، دەمبینی چۆن تا

نیوەی شەو بە دەوری ماڵەکەمدا دەسووڕایەوە تا ماندوو دەبوو.

زۆر جار دەڵێم ئەم هەستەی لە دڵمدا دروستبووە تەنیا بۆ ئەوەی ئازار بچێژم و لە ئازاری ئەوانە بگەم وا خۆشیان ویستم. بەدرێژایی کات بیرم لەخۆم دەکردەوە. لە ژیانێکی پڕ خۆشەویستی و بێ عەشق. نەمزانی من بۆ ئەو ژیانەم هەڵبژارد. من دەمتوانی ژیانێکی لە عەشق هەڵکێشراو هەڵبژێرم. پاش ئەوەی لە مەوداو ڕەهەندەکانی عەشق گەیشتم، بڕیارمدا لە پێناو گەیشتن بەو عەشقە بژیم و گەر خودی ژیان ڕێگەم نەدا لەگەڵ ئیگۆرد بژیم ئەوا تا دوا ساتی ژیانم تەنیا دەبم. ئێستا زانیم عاشقی کەسێکم لەو بەری ڕووبارەکەوەیە. نە مەلە دەزانم و نە لەهیچ لایەکەوە بەلەمێک وەدی دەکەم. مەگەر دڵم بکەمەوە تاشەبەردەکە، بە دووری نازانم مۆمەکە بکوژێنمەوەو چرۆکەش لە دارئەرخەوانەکەی ژیانم بکەمەوە. ئۆڵگا بەدەم گێڕانەوەی چیرۆکەکەی و لەسەر سنگی من خەوبردیەوە، منیش ئەمە بەهەل دەزانم تا ئەم هۆنراوەیەتان نیشان بدەم کە لە دیوانەکیدا بڵاونەکراوەتەوە.

ئەو ئێوارەیەی ڕووناکیەک وەک پەردەیەکی پەمەیی هەموو جەستەمی داپۆشی
ئەو ئێوارەیە دەموچاوێکی زبر خۆی خزاندە ئامێزی گۆنا شەرماوییەکەم
ئەو ئێوارەیەی لێوێکی تینوو هەموو جەستەمی خواردەوە.
ئەو ئێوارەیەی چاوێکی لەناو خەمدا خنکاو بووبە بەرگی بووکێنم.
ئەو ئێوارەیە بڕیارمدا هەردەم گوڵی هەتاوی سەما بم.
ئەو ئێوارەیە بڕیارمدا لەمە زیاتر خۆم نەخزێنمە سوچی زیندانی دڵێکی بێ ترپە.

لەو ئێوارەوە من خەندەم و باڵەکانم بەرەو ئاسمانی چاوە نوقاوەکانی بودەم دەبا.
ئێوارەکانی تر لە پەرستگای ڕۆحمدا،
چەند ساتێ نوێژ دەکەم
داوای لێبووردن لەوانە دەکەم لە ساتیکی ڕابردوودا،
لە زەمانێکی بیرنەکراودا
سوجدەیان بۆ ترپەی دڵم برد و
لەبەردەم پەیکەری سۆمای چاوەکانمدا نوێژییان کرد.
منیش بەرماڵەکەم لە ژێر سەریان ڕاکێشا و
بێ لاکردنەوە بەلایاندا تێپەڕیم.
ئەمڕۆ داوای لێبووردن لە هەموویان دەکەم.
ئەمڕۆ من هەموویان جێدەهێڵم و
لە ئامێزی ڕۆحمدا،
هێلانەیەکی ئاوریشمم بۆ خۆم دروستکردووە.
وشەکانم بۆ هەموویان دەهۆنمەوە.
گۆرانیەکی نەوتراو بۆ دڵم دەڵێم.
ئەمڕۆ من هەموویان جێدەهێڵم و
لە ئارامگای سبەیدا جارێکی دی،
وەک منداڵێکی یەک ساتە
بە ژیان ئاشنا دەبم و دەبمە ژنی ئەمەکداری چارەنووس.
سەما دەمبزوێنێ و پێکەنینیش دەمژێنێ و
لەباوەشی ڕووباری پێترادا خەو دەمباتەوەو
لە خەونەکانمدا سەر لەنوێ خۆشەویستی دەنووسمەوە.

ئۆلگا بەوە ناسراو بوو کە هەمیشەی خوا فرمێسکی حازرە. ئێستایش هەر

که ڕووداوێکی ئەوسای بیر دەکەوێتەوە، ڕۆحی دەبێتە پارچە هەورێک و دادەبارێتە خوارەوە. زۆر بە وردی بیر لە هۆکاری ڕووداوەکانی ژیانی سەرزەمینی دەکاتەوە تا بزانێ مەبەست چی بوو لەوەی کەوتە داوی خۆشەویستیی ئەو کەسەی لە کاتی گەنجێتیدا ئەمی خۆش ویستووە. لەوانەبێت بۆ نزیکخستنەوەی ئەم بێت لە چارەنووسی. پاش ئەوەی ژیان و داهاتووی خۆیی بەستبوو بە (ئەلفریدۆ)وە لەو باوەڕەدا نەبوو بکەوێتە خۆشەویستیی کەسەوە. ئەو دەستی لەوە هەڵگرتبوو کە ژیان بواری دەدات تینی گەرمای خۆشەویستی دەروونی داگیر بکات. لەوەیش پەشیمان نییە، وا کەوتە داوی خۆشەویستی پیاوێکەوە کە ناتوانی تام ردن ژیانی لەگەڵدا بباتە سەر. چونکە ئەو خۆشەویستییە بەختەوەریی ڕۆحی بەو بەخشی، هەر ئەو خۆشەیستییەیش بوو مانای ژیانی لای ئۆڵگا نەهێشت و بڕیاری دا کە کۆتایی بە ژیانی بهێنێ. ئێستا دەزانێ مانای ئەو خۆشەویستییە چی بوو لە ژیانی ئەودا. ئەو دەیگوت من لە پێناو یەک هیوادا دەژییتم، ئەویش لەدایکبوونی عەشق بوو لە دەروونمدا. ئەو هیوایەشی هاتە دی بۆیە بەردەوام بوون لە ژیاندا مانای تێدا نەمابوو. کەس لە شێوەی مردنەکەی نەدەگەییشت. ئۆڵگا نەیدەویست خوێنەرانی بزانن ئەو وەک ئاینپەروەرێکی بودیست بڕیاری سات و شێوەی مردنەکەی خۆی داوە. وێنەی مێردەکەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. دەسکێ گوڵی لەبەردەم وێنەکەیدا دانابوو، لە پشتی وێنەکەیشیەوە نوسیبووی «ببوورە گەر من پێش تۆ بمرم». ئەو کراسەی لەبەر کردبوو کە بە گەنجی کڕیبووی و بڕیاری دابوو ئەو کراسە ئەو شەوە لەبەر بکات کە لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا ئامێتەی یەکتر دەبن. ئەو لە مێشکی خۆیدا فیلمێکی بۆ سات بە ساتی ئەو شەوە گرتبوو. لەو تەمەنەیدا هەرچی ڕۆمان و دیوانی شیعری ڕۆمانسی هەبوو خوێندبوویەوە. ئەو ئەوەندی لەگەڵ ڕۆحی شیعر و کەسایەتییەکانی

ناو ڕۆمانەکاندا دەژییتا، لەگەڵ خۆیدا نەدەژییتا. ژیانی ئەو ژیانی خەیاڵی ناو هۆڵە گەورە پڕ گڵۆپە کریستاڵییەکانی سەدەکانی پێشوو بوو. وەک پەپوولەیەک دێر بە دێری ڕۆمانەکان دەگەڕا و لە هەر کوێیەکدا بیویستایە دەنیشتەوە. ئەو ئێوارەیەی ئەلفریدۆی لە بەلشۆی تیاتردا بینی، یەکسەر دەموچاوی یەکێ لە کەسایەتی ڕۆمانەکانی جۆن ئاوستنی هاتە پێش چاو. لە دڵی خۆیدا وتی ئەمە ئەوەیە من چاوەڕوانی دەکەم بەرەو ئەو ژیانەم دەبا وا دەمەوێ. لە گەڵیدا چوو بۆ ئیتالیا. بەڵام ئەو کراسەی لەگەڵ خۆیدا نەبرد، هەستی دەکرد ئەمە ئەو خۆشەویستە نییە کە ئەم چاوەڕوانیەتی. لەو باوەڕەیشدا نەبوو هێندە تاسەر لەگەڵ ئەم پیاوەدا بمێنێتەوە. لەوانەیە ئەم سەفەرەی بەرەو ئەو خۆشەویستەی ببات وا خەوی پێوە دەبینێ. یەکەمین جار لەگەڵ ئیگۆردا ڕۆح و جەستەی تێکەڵاو بوو ئەو کراسەی لەبەردەستدا نەبوو. هەربۆیە کراسەکەی بە قەدکراوی مابوویەوە. خۆی شۆرد و قژەکەی داهێنا و سووراوە تۆخەکەی جارانی کرد و ماسکارەی دا لە برژانگە درێژەکانی، کراسەکەی لەبەر کرد. ئەو ملوانکەیەیشی کردە ملی کە لە یەکێ لە ئایینپەروەرەکانی سەنتەری ئۆشۆ بە دیاری پێشکەشی کرابوو.

ئەو شاعیرێکی ناسراو بوو و گەنجان خۆشیان دەویست و هۆنراوەکانیان دەکردە گۆرانی. ئۆڵگا نەیدەویست پاش مردنی، لێشاوە گەرمەکەی خۆشەویستیی خوێنەرانی لە دەست بدات. هەروا نەیدەویست هەر ڕۆژنامەنووسێک بە جۆرێک داستانێک بۆ مردنەکەی بهۆنێتەوە. ئۆڵگا هێندە لەگەڵ جەستەی خۆیدا ئاشنا بووبوو، ترپەی دڵ و دەنگی هەناسەی خۆی دەناسییەوە. ئەو هەموو ڕۆژی دوو جار لەسەر میتودەکەی ئۆشۆ مێدیتەیشنی دەکرد. بۆیە ئاشنابوو لەگەڵ هەموو ئەندامانی جەستەی

خۆیدا. بۆیە دڵنیا بوو بە ئاسانی دەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ ئەو جەستەیەی کە هەستدەکات ڕۆڵی خۆی لەم سەفەرەدا تەواو کردووە. ئەو شتانەی پێویستی پێی بوو بردیە ئەو خانووی هاوینەیی کە لە باوکییەوە بۆی مابووەوە. پێش ئەوەی بڕوات دوا دیوانی شیعری کە بە مێردەکەی پێشکەش کردبوو ، لای ئەو دەزگایە جێ هێشت، وا بەرهەمەکانیان بۆ چاپدەکرد. لای هاوڕێکانیشی ڕایگەیاند دەچێتە خانووە هاوینیەکە تا لەوێ خەریکی پێداچوونەوەی دوا بەرهەمەکەی بێت. ئەو بڕیاری خۆی دابوو. هەفتەیەک پێش ئەوەی بڕوات بۆ خانووەکە، هەوڵی دەدا تەنیا و تەنیا لەگەڵ خۆیدا بێت و ڕۆح و جەستەی لە دوا ساتەکانی ژیان لێکبئاڵێن و سوپاسی یەکتربکەن. ڕۆح سوپاسی جەستەی دەکرد چونکە ماوەی ئەم چەند ساڵە هاوڕێیەکی بەوەفا بووە و لە کاردا بووە بۆ هێنانەدیی مەبەستەکانی ڕۆح. جەستەیش بە دڵشکاوییەوە سوپاسی ڕۆحی دەکرد کە ئەم جەستەیەی هەڵبژاردووە و ئەم ماوەیە ئەم هەموو خۆشەویستییەی پێبەخشییوە. من شایەتی دەدەم. ئۆڵگا زۆر گرنگی بە جەستەی خۆی دەدا، هەر بۆیە کەس نەیدەتوانی تەمەنی بزانێ. جەستەی وا بەگەنجی مایەوە تا بە خاکی سپارد. ئۆڵگا یەکێک بوو لەو کەسانەی هەر زوو کەوتە ناو جیهانی ڕۆحییەوە. پاش هاتنەکەی بۆ ئیتالیا، ئاشنای جیهانێکی نوێ بوێ، لە گەلێ دەرگای دا. دەچووە کۆرسی فێربوونی زمانی ئیتالی. لەوێ ئاشنایەتی لەگەڵ ژنێکی مەکسیکی پەیداکرد. هەر ئەو بوو کلیلی دەرگای ئەو جیهانەی پێبەخشی. هەر بۆیە یەکێ لە دیوانە شیعرییەکانی بەو ژنە پێشکەش کردبوو. خۆشی لەم نهێنییە نەگەیشت، چی ئەمی گەیاندە جیهانی ڕۆحی ونزیکی کردەوە لە ڕەوتی نیوئەیج ."New age» بەهیوا بوو لەڕێگەی ئەم بیرکردنەوە تازەیەوە خۆی بدۆزێتەوە. کەوتنە خوێندنەوەی کتێب و سەری بە هەموو ئەو سەنتەرانەدا دەکرد. پاش سەفەرەکەی هیندستان زیاتر

له مەسەلەی ڕۆحیانەتدا قوڵ بوویەوە. کەسێکی وەک ئەم لە وڵاتێکدا گەورە بووە، هەموو تاکەکان وەک کەسێکی ئەتەیست گەورە دەکران. تەنانەت ئەو دایکو باوکی سەر بە دوو ئاینی جیاوازبوون. کەسیش بیری لەو مەسەلەیە نەکردەوەو بە شتێکی نامۆیان نەدەزانی. ئەمیش خۆی سەر بە هیچ یەکێ لەو ئاینانە نەدەزانی و بڕوای بە هیچ شتێ نەبوو، لە خۆی زیاتر.

گرنگ با بێمەوە سەر مردنەکەی، هەندێ جار ئەوەندەم لە کۆڵە پشتەکەمدا هەڵگرتووە، ڕەوتی شتەکانم لە بیردەچێتەوە. ببوورن. هەفتەیەک لە سەر جێگاکەی پاڵکەوت و چووە ناو قوڵایی خۆییەوە. ئەوە ئامانجەکەی دۆزییەوە کە لە پێناویدا هاتبووە سەر ئەم زەمینە. پاش بزەیەک و ئارامییەکی قووڵ دڵی لە لێدان کەوت. هەفتەیەکی ویست تا زانییان ئەو مردووە. یەکێ لە ڕۆژنامەنووسەکان زوو گەیشتبووە سەری. وێنەی دەموچاوی ئۆڵگای گرتبوو. ئارامی و بزەکەی سەر لێوی زۆر بە ئاشکرا دەرکەوتبوون و یەک دڵۆپ فرمێسک لە چاوی چەپیدا قەتیس مابوو. ئەو ڕۆژنامەنووسە بەهۆی ئەو وێنەیەوە ناوبانگی دەرکرد و دەوڵەمەند بوو. ئەو کاتەی ئۆڵگا گەیشتە خواوەندی عەشق و بڕیاری دا لە پێناو خۆشەویستیدا نەجەنگێ، هیچ مانایەکی لە ژیاندا نەدەبینییەوە. ئۆڵگا لە ژنەکانی تری نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەی لەگەڵ پیاوێکدا دەژییتا خۆشیدەویست و عاشقی نەبوو بەڵام ئەمەکداربوو. ئەو پیاوە عاشقی بوو، یەکێک بوو لەو پیاوانەی وەک جبران خەلیل جبران بیری لە خۆشەویستی دەکردەوە. ئەو دەڵێ گەر کەسێکت خۆش بوێ مانای ئەوە نییە بیکەی بە موڵکی خۆت. بتەوێ وەک تۆ بژی وەک تۆ بیربکاتەوە، بە ئارەزووی تۆ هەستەکانی دەرببڕێ. گەر خۆشەویستی وایلێهات ئەوا مەودای خۆشەویستی لە نێوان ئەو دوو کەسەدا نامێنێ

و ئەو هەستە جوانە دەمرێ. بۆیە هەموو ئاسانکارییەکی ژیانی بۆ دابینکردبوو. بۆ ئەوەی ئۆلگا ئەو ئۆلگایە بێت کە خۆی دەیەوێ. ئەو کاری نەدەکرد هەموو کاتی تەرخانکردبوو بۆ خوێندەوەو نووسین و کاری کولتووری. مێردەکەی دەیزانی ژنەکەی دەیان عاشقی هەیە، بەڵام گوێی نەدەدایە عەشقی ئەو پیاوانەی کە بەدەوریدا دەهاتن. ئۆلگا بە وردی باسی یەکە یەکە ئەوانەی دەکرد کە عاشقی ببوون، پاشان بە پێکەنینەوە دەیگوت خەمت نەبێت عاشقی هۆنراوەکانمن نەک خۆم. ئەویش بە وردی گوێی بۆ دەگرت و هێندەی تر خۆشەویستی لە چاوەکانیدا گڕی دەسەند. ئێستا لەوە دەگەن بۆ ژیان هیچ مانایەکی بۆ ئۆلگا نەبوو.

هەموو جار دەڵێم ئۆلگا بوونەوەرێکی بەبەخت بوو. ئەوانەی لە دەوری بوون خۆشیان دەویست و دڵسۆزی بوون. ئەو هاوڕێیەی وا یەکەمین کەس گەیشتە سەر جەستە بێ هەناسەکەی، هەموو ئەو شتانەی کۆکردەوەو خێرا خستیە جانتاکەی شانیەوە. ئەو نووسراوانەی کەوا ئۆلگا نەیدەویست بەر دەست ڕۆژنامەنووسان بکەوێ. من هەر لە ڕێگەی ئەوەوە توانیم نامەکەی و ئەو شیعرەم دەستکەوێ کە خستمە بەردەست ئێوە. ئۆلگا تاقانە کچی دایک و باوکی بوو. باوکی موسڵمانێکی بێباوەڕی ئۆزبکستانی بوو، دایکیشی کچە ڕووسێکی خێزانێکی ڕۆشنبیری شاری مۆسکۆ بوو. دایکی پاش کۆچیدوایی مێردەکەی بە دوو مانگ ژیانی بەجێ هێشت. ئەوکات ئۆلگا بۆ شەش مانگ چووبووە هیندستان و لە شاری گووا دەژییتا. پاش ئەو شەش مانگە ئۆلگا بوو بە پارچەیەک لە ئارامی جەستەیی و ڕۆحی. ئەم ئارامییە تەواو لە هەڵسوکەوت و بەرهەمەکانییدا دەبینرا. بڕیاری دابوو کە گەڕایەوە بڕوات بۆ مۆسکۆ و ماوەیەک لەگەڵ دایکو باوکیدا بژی. کاتێ گەڕایەوە ڕۆما، شەوێکی دوورو درێژ باسی سەفەرەکەی بۆئەلفرێدۆ کرد.

هەروا پێی وت بەنیازە بچێت بۆ لای دایکو باوکی، ماوەیەک لەلایان بمێنێتەوە. ئەلفریدۆ ئۆلگای لە ئامێزگرتوو و دەستی بەسەریدا هێناو ئەو هەواڵە دڵتەزێنەی پێی ڕاگەیاند. هەروا بۆی باس کرد ئەو خۆی مەراسیمی ناشتنەکەی جێبەجێکردووە. باوکی بردووەتەوە ئۆزبکستان و دایکیشی ویستوویەتی لەهەمان گۆڕستانی مێردەکەی بێت. بۆیە هەردووکیان لە یەک ئارامگان. ئەو هەوڵی داوە شتەکان بە هێمنی بڕوات بەبێ ئەوەی مێدیا سەرنجی بدەن. ئۆلگا لە باوەشی ئەلفریدۆ وەک منداڵێک دەگریا. خۆشی نەیدەزانی ئەم هەموو فرمێسکە لە کوێدا خۆی حەشارداوە. هەستی بە ئازارێکی لەبن نەهاتوو دەکرد. نەیدەزانی ڕەگی ئەم ئازارە لە کوێی دڵی ڕەگی داکوتاوە. ئەلفریدۆ دوو ڕۆژ بەدیارییەوە بوو، بۆ ساتێک چییە بەجێی نەدەهێشت. ئۆلگا دەیزانی مردنی ئەوان کۆتایی بە ژیانی جەستەیە نەک ڕۆح، بەڵام تامەزرۆی ئامێزێکی دایکو باوکی بوو. ئەو ئامێزەی تا هەبوو هێندە نرخی بۆ دانەنابوو. ئەوان تاقە کچەکەیان هێندە خۆشدەویست، هەرگیز ڕێگەی هیچ شتێکیان لێی نەدەگرت کە حەزی لێیبووایە. ئەوەندی توانیبێتیان پێداویستییەکانیان بۆ بەجێدەهێنا. ئۆلگا لەو جۆرە مرۆڤانە بوو هەر زوو بە گەنجی ڕێگەی ژیانی خۆیی دۆزییەوە و لە دایکو باوکی دابڕا. ئۆلگا بەردەوام دوای لێبووردنی لە دایک وباوکی دەکرد، لەبەرئەوەی لەبەر سەرقاڵی بە ژیانی خۆی و بەرهەمەکانی هێندە هەواڵی ئەوانی نەدەزانی. لەگەڵ ئەوەی لە ڕووی ئابوورییەوە زۆر یارمەتیدەدان و ناردنی بۆ چەند وڵاتێک و لەم دواییەدا پارەی دەدا بە ژنێک تا خزمەتیان بکات. ئەوان بەم یارمەتییانەی ئۆلگاوە دڵخۆش بوون، زۆر تامەزرۆی بینینی ئەو بوون. ئەویش لەبەر سەرقاڵییەکانی ژیان هێندە نەیدەپەرژایە سەریان. ئەوان بەردەوام لای کەسەکانی دەوروبەریان شانازییان بە کچەکەیانەوە دەکرد. لە ڕێگەی هاوڕێکانی ئۆلگاوە هەندێ

جار کۆڕه شیعریان دەگرت. هەندێ جاریش وەک ئەو کاتەی کە خۆی لە مۆسکۆ بوو، دەچوونە ماڵە هاوینییەکە. ئۆڵگایش بەمە زۆر شادمان دەبوو. لە خۆشیدا فرمێسک بە چاوانیدا دەهاتە خوارەوە و زۆر بیری ئەو ساتانەی دەکردەوە کە لەگەڵ هاوڕێیانیدا دەیدایە سەر. شتێک هەبوو ئەوی بە ئەلفریدۆ و ئیتالیاوە دەبەستەوە کە خۆیشی نەیدەزانی چییە. چەندی هەوڵ دەدا ئەو ژیانە جێ بهێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ مۆسکۆ، کەچی نەیدەتوانی.

هەتاو فرمێسک بە چاوانیدا هاتەخوارەوە، ئا لەو ساتەدا نەورۆز و هانس لەلای دانیشتبوون و بەشێک لە یادەوەرییەکانیان بۆ دەخوێندەوە. کە فرمێسکی چاوانی هەتاوییان بینی لە خۆشیدا هاواریان کرد، دکتۆرو پەرستارەکان هاتنە ژوورەوە. ئەم فرمێسکانەیان بە نیشانەی بوونی جۆرە پەیوەندییەکی نێوان هەتاو و یادەوەرییەکانی دانا. نەورۆز و هانس لە خۆشیدا باوەشیان بەیەکدا کرد. ئەوان نەیانزانی فرمێسکەکانی هەتاو بۆ ئەو وشانە نییە کە ئەوان دەیخوێننەوە بەڵکو بۆ ئازارەکانی ئۆڵگا و خۆیەتی. ئەوان هەردووکیان بۆ خۆشەویستییەکەیان نەجەنگان. لەوانەشە هەربۆیە ڕۆحەکانیان یەکترییان دۆزیوەتەوە. ئەمان هەردووکیان خۆشەویستی خۆیانیان کردە قوربانی، گوایە بەختەوەری کەسانی تر تێکدەدەن. هەتاو لە پڕێکدا سەری لەسەر ڕانی ئۆڵگا لابرد وتی «دەزانی هەردووکمان هەڵە بووین. ئێمە خۆمان بەختەوەرنەبووین، ئەوانەشی کە لەبەر بەختەوەریی کەسانی تر وازمان لێ هێنان بەختەوەر نین، ئەوانەیشی لەگەڵیاندا دەژییتن هەر بەختەوەر نینە.»

هەردووکیان بڕیاریان دا گەشتێک بکەن تا بزانن خۆشەویستەکانیان بەختەوەرن. هەر زوو گەیشتنە ماڵەکەی هانس. هانس لەگەڵ منداڵەکانیدا دانیشتبوو، تەماشای فیلیمێکیان دەکرد. کە چوونە ناو

بیرکردنەوەکانی، وێنەی هەتاوییان بینی. سارا هات لایەوە دانیشت و سەری خستە سەرشانی، هانس لای بۆکردەوەو دەموچاوی هەتاوی بینی. ئەمجارەیان سەیرێکی کردەوە دەموچاوی سارای بینییەوە. پەشۆکا و هەڵسایە سەر پێ و چووە ژوورەکەی خۆی. سارا بە دوایدا ڕۆیشت. منداڵەکان تەلەڤزیۆنەکەیان کوژاندەوەو هەریەکە چوونەوە ژووری خۆیان.

ئۆڵگا وتی «دەبینی کەسیان بەختەوەر نینە. تۆ دەبوایە ملت بۆ سارا نەدایە و پاش ئەوەی تۆی بە جێ هێشت، پەیوەندیت بە هانسەوە کردبایە و ئاگادارت بکردایەتەوە کە لە کوێی. گەر ئەو نەهاتایە بۆ لات ئەوە مەسەلەیەکی تر بوو.»هەتاو بێدەنگ بوو، وەک ئەوەی دان بەڕاستی بۆچوونەکانی ئۆڵگادا بنێ. ڕاستیش دەکات، کێ دەڵێت هانس و هەتاو و هانسی کوڕی بەختەوەردەبوون و خۆ لەوانەش بوو ساراش کەسێکی بدۆزییاتەوە بە هێمنی بژیایە. جا کێ دەڵی دۆزینەوەی پیاو هێندە کارێکی ئاسانە بە تایبەتی بۆ ژنێک ئەم هەموو ساڵە پیاوێکی خۆش ویستووە و تەمەنی سەرووی چلەکان بێت و دوو منداڵیشی هەبێت. گەیشتنە لای ئیگۆر، لە خانوویەکی تردا دەژییتن، ئیگۆر لەماڵ نییە، ژنەکەی لەگەڵ هاوڕێیەکی دانیشتووەو باسی ئیگۆری بۆ دەکات. «ئەوە چەند ساڵێکە خەندەم لە دەموچاوی ئیگۆردا نەبینیوە. ئەو هەردەم بەبێدەنگی دێت و دەچێت. هەست ناکەی ئەم جەستەیەی ئەو ڕۆحی تێدایە. کە دێتەوە ماڵەوە خەریکی خوێندنەوەی شیعرە، زۆربەی دیوانەکانی ئۆڵگا پیترۆڤنە وماریا سڤێتلانەی  لەسەر مێزەکەی داناوە. لەوەش ناکات بیانخوێنێتەوە. هەردووکیان دوو ژنە شاعیرن و هەردووکیان نەماون. گەر بمانایە دەمووت عاشقی ئەوانە. هەردووکیان شیعری جوانیان لەسەر خۆشەویستی نووسیووە. بەتایبەتی ئۆڵگا. ئەو ماوەیەکی زۆری

ژیانی لە ئیتالیا و لەگەڵ پیاوێکی پیردا بردووەتە سەر. کە دەگەڕێتەوە ئێرە پاش چەند مانگێ بەتەنیا لە خانووە هاوینەکەیدا دەمرێ. مێردەکەی لە ناشتنیدا کۆمەڵێ لە شیعرەکانی بە ڕووسی خوێندوەتەوە. هەموو گۆڤارەکان باسی خۆشەویستی ئەو پیاوە دەکەن بۆ ئۆلگا. ئەو باشترین ساتی ماڵئاوایی بۆ ئۆلگا ڕێکخست. تیپی سیمفۆنیای نەتەوەیی ڕووسیای بۆ ساتی ماتەمینی بانگهێشتکرد و تا بەشێک لە سیمفۆنیاکانی شۆپین و چایکۆفسکی لێبدەن. ئۆلگا بەردەوام گوێی لە سیمفۆنیاکانی ئەوان گرتووە، بە تایبەتی کاتێ شیعری نووسیووە. هیچ ڕۆژنامەنووسێک نەیتوانی نهێنی هاتنەوەی ئۆلگا پیترۆڤنە بۆ موسکۆ بزانێ. ئەو هیچ شتێکیشی بۆ هاوڕێکانی باس نەکردبوو تەنیا ئەوە نەبێت کە دەیەوێ خەریکی بەرهەمە تازەکانی بێت. کە مردیش ئەو وێنەیەی کە وێنەگرێکی ڕۆژنامەنووس گرتبووی ماوەی چەند هەفتەیەک لە ڕۆژنامەکاندا بڵاودەکرایەوەو هەریەکە بە شێوەیەک ئەو بزەو هێمنییەی دەموچاویان شیدەکردەوە«. ژنەکەی هاوڕێی وتی «بڵێی مێردەکەت عەشقی ئەو ژنە شاعیرە نەبووبێت؟، بیرت چوویەوە هەر پێش مردنی ئەو بوو ئیگۆر باری دەروونی تێکچوو، بیرتە نەدەچووە کار و لە ژوورەکەی نەدەهاتە دەرەوە. خۆ خۆت هەموو شتێکت بۆ باس کردم. ژوورەکەی تاریک کردبوو. ئەویش گوێی لە سیمفۆنیاکانی چایکۆفسکی دەگرت. بە زۆر خواردن و خواردنەوەت دەدا پێی. بۆ بیرت نەماوە، دەبێت پەیوەندیەک هەبێت لە نێوان مردنەکەی ئەو ژنەو، ئەم بارەی ئیگۆر؟.» ئا لەو کاتەدا ئۆلگا تەواو شپرزەبوو وکەوت بەسەر پێکە شەرابەکەی ناتاشادا. شەرابەکە ڕژایە سەر فەرشەکە. ناتاشا لەبەر خەمی فەرەشە تازەکەی ئەو تێبینییە دروستەی هاوڕێکەی لەبیرچوویەوە. هەردووکیان کێلۆیەک خوێیان کرد بەسەر فەرشەکە و بە پەرۆ دەیان سڕییەوە. کەسیان بیرییان لەوە نەکردەوە ئەو پێکە شەرابە چۆن ڕژا، لە کاتێکدا

کەسیان دەستیان بەر پێکی شەرابەکە نەکەوت. لەو ساتەشدا ئیگۆر هاتە ژوورەوە، لە دەموچاویدا ئارامییەکی زۆر بەدی دەکرا. هەتاو تەماشایەکی ئۆڵگای کردو داوای لێی کرد ماچێکی بکات. ئۆڵگا چووە پێشەوە لێی و خۆی تێکەڵ بە خەرمانەی جەستەی کردو ماچیکی کرد و توند لە ئامێزی گرت. ئیگۆر وەک ئەوەی ڕۆحی پێدا بکرێتەوە گەش بوویەوە. کەسیش لەو گۆڕانکارییە نەگەیشت کە لە ئیگۆردا ڕووی دا. ئۆڵگاو هەتاو دەستی یەکترییان گرت و لە ماڵەکە هاتنە دەرەوە.

هەتاو ڕووی تێکردو وتی»ئێستا دەزانـی تۆش هەڵە بـووی، تۆش شاعیرێکی ترسنۆک بوویت، لە شیعرەکانتدا زمانت درێژەو لەسەر عەشق و شەیدایی دەنووسی کەچی ئامدەنەبووی بۆ عەشق بجەنگێی.» ئۆڵگا بۆ ماوەیەک هەڵوێستەی کردو قووڵ ڕاما و وتی «نا وابزانم هەڵەبووی، ئیگۆر ئامدەنەبوو واز لە ژنەکەی بێنێ، ئەو دەیویست من وەکو دۆستێک لەگەڵیدا بمێنمەوە، منیش هەرگیز ئەوەم قبوڵ نەبوو. پاش ئەوە من نەمهێشت لەوە زیاتر تێکەڵ بە یەکتربین، ئەگینا کەسمان نەماندەتوانێ بەبێ یەکتر بژین. هەستم دەکرد ئەو لەم ژیانەدا هی من نییە. نەمدەویست ژیانی خێزانەکەی تێکبچێ. بەتایبەتی پاش ئەوەی زانیم پێش ناتاشا ژنێکی تری هەبووە و دوو منداڵیشی لەو هەیە. من هیچ جۆرە فشارێکم نەخستە سەری و داوای ئەوەم لێنەکرد کە واز لە ژنەکەی بهێنێ. کە خۆشەویستییەکی هێندە قووڵ لە دەروونتدا دروست دەبێت، ناتەوێ بەهیچ جۆری ببیتە سەرچاوەی ئازارو گرانی بۆ خۆشەویستەکەت و ئەوانەی دەوروبـەری. دوا ئێوارە کە پێکەوە بووین، ماڵئاوایم لێی کردو ئیتر وەڵامی تەلەفۆنەکانیم نەدەدایەوە و بڕیارم دا لە ژیانیدا نەمێنم. ئەو ساتە زانیم سنووردانان بۆ خۆشەویستی کارێکی مەحاڵە، چەند دیواری ئەو سنوورە بەرزبکەیتەوە ئازارەکان

هێندەی تر دەست دەخەنە بیناقاقای ترپەی دڵتەوە تا وات لێدێت ناتەوێ گوێت لە ترپەی دڵی خۆت بێت. ونبوونی هەردووکمان لەژیانی یەکتردا خاڵێکی بۆ ئەو هیوایە دانا کە هەردووکمان ئەو هەموو ساڵە لە پێناویدا دەژییتاین. خۆشەویستی من لە دڵیدا لەماوەی ئەو هەموو ساڵەدا کەڵەکە ببوو. کە منێکی وا کراوەی بینی، لێشاوی هەستە شاراوەکانی وەک لافاوی پایز هەڵساو دڵەکەی منیشی لەگەڵ خۆی برد. هەربۆیە منیش وا بەخێرایی کەوتمە خۆشەویستی ئەوەوە و بێ شەرم ئەو هەستەی خۆمم بۆ ئاشکراکرد، وا هەستم کرد ئارامیم پێببەخشێ. لەو باوەڕەدام هەموو ژیانی چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد ڕۆژێ لە ڕۆژان من پێی بڵێم خۆشمدەوێت. کاتێ ئەو ڕستەیەی لە منەوە گوێ لێبوو، ئیتر ئەویش گەیشتە مەبەستی خۆی و لەوێدا هەردووکمان گەیشتینە ئەو لووتکەیەی کە لە پێناویدا دەژییتاین. من عاشق بووم ئەویش ئەو کەسەی ویستی عاشقی بوو. هەردووکمان کۆتایمان بۆ ڕستەکە دانا. ئۆلگا سەری خستە سەر سنگی هەتاو و تێرگریا، فرمێسکەکان دابارینە سەر سنگی هەتاو. ئا لەو کاتەدا هانس سەری خستە سەر سنگی دایکی و هەستی کرد سنگی تەڕە، ئەمجارەشیان زەنگیان لێدایەوەو هەموو ڕایانکردە ژوورەکەی هەتاو. هەتاو ئارەقی کردووە، ئەمەش نیشانەیەکی پۆزەتیڤە.

ئۆلگا دەستی کرد بە پێکەنین و وتی «وا دەزانن کە ئارەقتکردووە، نازانن هەمووی فرمێسکی منە.»هەتاو دایە قاقای پێکەنین و هەموو ئەوانەشی لە ژوورکەکەدا بوون دایانە قاقای پێکەنین. هێندەی نەبرد هەموو ئەوانەی لەو خەستەخانەیەدا بوون دایانە قاقای پێکەنین. بەداخەوە لەو ساتەدا نە کامیرای تەلەڤزیۆنێ نە ڕۆژنامەنووسێک لەو ناوە بوو تا ڕاپۆرتێکی سەرسوڕهێنەر لەسەر شەپۆلی ئەو پێکەنینە بنووسن کە

بۆ ساتێ خەستەخانەکەی گرتەوە. ئۆلگا دەستی ڕۆحی هەتاوی گرت و ژوورەکەیان جێ هێشت، پاش ڕۆیشتنی ئەوان هێمنییەکی سەیر ژوورەکەی داپۆشی.

نەورۆز یادەوەرییەکانی هەتاوی داخست و دەستی هانسی گرت و بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتنەوە. ئەو ئێوارەیە هەردووکیان تەواو مات وبێدەنگ بوون. لە ڕووداوەکانی ئەمڕۆ تێنەدەگەیشتن. نەورۆز خواردنەکەی گەرمکردەوەو بانگی هانسی کرد تا نانەکە بخوات. کەچووە هۆڵەکە بینی هانس لەسەر قەنەفەکەی هۆڵەکە خەوی لێکەوتووە. بە هێمنی هانسی هەڵگرت و بردیە سەر جێگەکەی خۆی و جلەکانی لەبەرداکەندو جلی خەوی لەبەرکرد. ئەوجا هەر لە تەنیشت ئەوەوە پاڵکەوت. هەردووکیان نیوەی شەو خەبەریان بوویەوە. تەماشایەکی یەکیان کرد و پێکەنین، بەرەو موتبەخەکە ڕایانکرد. هەردووکیان زۆر برسییان بوو. نەورۆز خێرا چێشتەکەی گەرمکردەوەو بەو نیوە شەوە تێروپڕیان خوارد. دیارە تا بەیانی کەسیان خەویان لێناکەوێتەوە. نەورۆز وتی «تازە ناخەوین، وابزانم هەردووکمان تێرخەو بووین، وەرە بابڕۆین خۆمان بشۆین، لە پێشدا تۆ دەشۆم، پاشان خۆم.»هانس ئەم پێشنیارەی بەدڵبوو. خێرا چوو، جلی پاکی هێنا. ئەوە یەکەمین جارە هانس لەگەڵ پیاوێکدا خۆی دەشوات. لەوەتی چاوی کردووەتەوە لەگەڵ دایکیدا هەموو شتێکی کردووە، لە خۆشتنەوە تا چوونەدەرەوەو نانخواردن و چوونە بازاڕ و شت کڕین. ئەم ماوەیە نەورۆز هاتە ناو ژیانیانەوە. ئێستا تۆزی گەورەتربووە و بە شێوەیەکی تر لە شتەکان ورد دەبێتەوە و زۆر جاریش کە دەچێتە ماڵی هاوڕێکانی شێوەیەکی تری ژیان دەبینێت. زۆربەیان لەگەڵ دایکوباوکیاندا دەژیێن. بۆ ئەو ئەمە جێگەی پرسیارە کە تەنیا خۆی و دایکی پێکەوە دەژیێن. پێش نەورۆزیش هیچ پیاوێک

سەری نەکردووە بەماڵەکەیاندا. هانس چاوەگەشەکانی زیاتر کرایەوە و تەماشای نەورۆزی کرد و وتی «دەتوانی باسی منداڵی خۆتم بۆ بکەی». سات بەساتی منداڵێتی دایکی لەبیرە، هەتا ئەو کاتەی کە چووەتە زانکۆ. ئیتر پاش ئەوە دایکی باسی هیچ شتێکی بۆ نەکردبوو. ئا لەوێدا هەموو ژیانی دایکی تەواو بوو. هەر کاتێکیش داوای لێبکردایە بەسەرهاتی ژیانی بۆ تەواو بکات، بەردەوام خۆی لێ دەدزییەوە. هانس ڕوویکردە نەورۆز، داوای لێی کرد کە ئەویش باسی ژیانی منداڵی خۆیی بۆ بکات. ئەو حەزی دەکرد شتێکی هاوبەش لە نێوانیاندا بدۆزێتەوە. دایکی هیچ کاتێ ناوی نەورۆزی نەهێناوە. تەنیا پێش هاتنەکەی هەندێ باسی نەورۆزی بۆ کردووە. لەکاتێکدا نەورۆز زۆر یادەوەری لەگەڵ دایکیدا هەیە، هەرچەندە ئەو ماوەیەش کورت بووە. نەورۆز وتی «با دایە چاک ببێتەوە بۆ هەردووکتان دەگێڕمەوە«. هانس بە پێکەنینەوە وتی «دەی یەک شت. یەک شت، شتێ کە خۆت و دایکمی تێدا بێت.». نەورۆز بیری کردەوە. نەک یەک یادەوەری بەڵکو هەزاران سات هەیە کە هەردووکیانی تێدایە. نازانێ کامەیان هەڵبژێرێ. «ئێ باشە باسی شتێکت بۆ دەکەم، کاتێ هەردووکمان لە کۆلێژ بووین .من دایکتم زۆر خۆشدەویست ئەویش بەمەی نەدەزانی، چونکە من باسم نەکردبوو بۆی. جا پێکەوە چووین بۆ سەیرانێک. ئەو کاتە من تازە کامێرەیەکم کڕیبوو، کە زۆر دڵم پێیخۆشبوو. ئێستاش ئەو ڕۆژەم لە بیرە، قوتابیانی چەند کۆلێژێ چووین بۆ سەیران. هەرچۆنێ بێت جێگەی خۆمم کردەوە لەو پاسەی کەدایکتی تێدابوو. لە ڕاستیدا چەند برادەرێکم دەیانزانی من دایکتم خۆش دەوێت، بۆیە جێگایان بۆ گرتم لەو پاسەدا. پاشانیش توانیم جێگەکەم لەگەڵ کچەکەی تەنیشتیدا بگۆڕمەوە. ئیتر لە خۆشیدا نەمدەزانی چی بکەم. بە ڕێگەوە گۆرانیمان دەوت، بە بیرمە گۆرانی یەکەم هەنگاو هی کچ بووەو نازی کوڕی هەڵگرتووەمان دەوت. بە

هەموو هێزم ئەو گۆرانیەم دەوت. هەر منیش بووم هەموو وشەکانی ئەو گۆرانییەم لەبەربوو، بۆیە هەموو لە دوای منەوە دەیان وتەوە. دەزانی من لە لەبەرکردنی گۆرانی زۆر زیرەکم. هەر کە یەک دوو جار گوێم لە گۆرانییەک دەبێت لەبەری دەکەم. ئەو کاتە ئاگام لە خۆم نەبوو، دایکت بە هێمنی و بە پێکەنینیەوە وتی «تۆزی هێواش بەخوا دەنگت ناخۆشە.»منیش پێکەنیم و هیچم نەوت. ئیتر پاش ئەو قسەی ئەو بێدەنگ بووم. ئەو شوێنەی بۆی چووین زۆر خۆشبوو، هەموو خواردنمان لەگەڵ خۆماندا بردبوو. من ئاگام لە خواردن نەما. هەر خەریکی وێنەگرتنی دایکت بووم. هاوڕێکانم گاڵتەیان پێدەکردم و دەیان وت»هەتاو بە کولاوی، هەتاو بەکاڵی، هەتاو بە ڕووتی، هەتاو بە برژاوی، هەتاو...»ڕاستیان دەکرد کە وێنەکانم شۆردەوە هەمووی وێنەی ئەو بوو. ئەو پیاوەشی کە وێنەکانی بۆ شۆردمەوە وتی تۆ عاشقێکی زۆر خەتەری. وێنەکان هەمووی وێنەی ئەو بوون، هەتاو نانی دەخوارد، ماستاوی دەخواردەوە، نانێکی دەبرد بۆ دەمی، هەڵدەپەڕی، پێدەکەنی، قسەی دەکرد، قاچی خستبووە ناو ئاوەکە، یا یاری بە قژی دەکرد، دەستی دەشۆرد، لەسەر بەردێک لە لای ڕووبارەکەوە دانیشتبوو، لە سێبەری دارێکدا پاڵکەوتبوو... . سیوشەش وێنە بوو هەمووی ئەوی تێدا بوو. دایکت ئێستاش جوانە، بەڵام ئەو کاتە جوانییەکەی وەک جوانی فریشتە وابوو، چاوە سەوزەکانی زۆر گەشبوون. زۆر جار کە ئەوم دەبینی وێنەی ئەو پەرییانەم دەهاتە پێش چاو کە کچەکانی مەکتەب دەیانکڕی و دەیاندا لە دەفتەرەکانیان. پێکەنینەکەی وەک شەماڵ فێنکی دەکردیتەوە. ئەو وێنانەم هەڵگرت، تەنانەت کە چووم بۆ پێشمەرگایەتی تەنیا یەک وێنەم لەگەڵ خۆمدا برد. ئەوانەی ترم لای دایکم دانا و داوام لێی کرد هەموویم بۆ هەڵگرێ. بەڵام بەداخەوە جارێک لە ترسانا هەموو شتەکانی منی سووتاندبوو،

ئەو وێنانەشی لەگەڵدا بوو. نیگای دایکت لەو وێنەی بردبووم لەگەڵ خۆمدا بوو زۆر سیحراوی، سەیری شوێنێکی دەکردو بزەیەک لەسەر لێوی بوو، باش یاری بە قژە درێژەکەی دەکرد و هەتاویش لە پشتیەوە بەرگی پەمەیی پۆشیبوو. ئەو وێنەیە لە گیرفانمدا بوو. لە سەردەمی پێشمەرگایەتیدا، کاتێ شەوان پاسەوان بووم لەبەردەمی خۆمدا دام دەناو بە ئەسپایی گۆرانیم بۆ دەگوت. چیم لەو وێنەیە کرد، خۆم دڕاندم. لە شەڕێکدا بووین، شەڕێکی گەورە لەگەڵ جاش و سەربازەکانی سەدامدا. ئەوان زۆر بوون و ئێمە کەم. بۆیە بڕیارمان دا پەرتوبڵاوەی لێ بکەین و هەر یەکە لەلایەکدا خۆی بشارێتەوە. من لە بن چەند دارێکی چڕو پڕدا خۆمم شاردەوە. بە تەما نەبووم بە زیندوویی ڕزگارم بێت. بۆیە تفەنگەکەم خستە سەرڕێ و بڕیامدا گەر ئەوان لێم نزیک بکەونەوە چەند دانەیەک لەوان دەکوژم و پاشان دوا فیشەک بۆ خۆم دەبێت. ئا لەو کاتەدا بیرم لە وێنەکەی دایکت کردەوەو وتم نابێت وێنەکەی تۆش بەردەست ئەو فاشیانە بکەوێت. چەند جارێ وێنەکەم ماچکردو وتم»هەتاو گیان هەر پێت دەگەم، گەر مردیشم هەر دێمەوە لات.»پاشان وێنەکەم پارچەپارچە کرد و هێندە ورد دڕاندم کە نەزانن ئەم پەرییە کێیە. دەستم کرد بە گریان. دەزانی چاوەڕوانی مردن کارێکی زۆر سەخت بوو بۆم. تەنیا بیرم لە دایکم و دایکت دەکردەوە. چاوم نوقاندو ئەو ئاوەی پێم بوو خواردمەوە. نازانم چۆن خەوم لێکەوت. کە خەبەرم بوویەوە، ئەو ناوە تاریک و کشومات بوو. لەوەی نەدەکرد کەسێک لە هاوڕێ پێشمەرگەکانم لەو ناوە مابێتن. دەستێکم برد بۆ وێنە وردکراوەکە و ئەوەی بەردەستم کەوت هەڵمگرتەوەو خستمە گیرفانمەوەو هەستام و ڕێگایەکم گرتە بەر کە نەمدەزانێ بەرەو کوێم دەبا، ئەو ڕێگایە بەرەو خاکی ئازادکراوی بردم. دەمەو بەیانی گەیشتمە بارەگای پێشمەرگەکان». نەوروز ئەمەی دەگێڕایەوە

فرمێسک بە چاوانیدا دەهاتە خوارەوە. ئاگای لەوە نەبوو ئەو قسانە بۆ منداڵیکی هەشت ساڵان دەکات و زۆر لەو قسانەی دەیکات ئەو لێی تێنەدەگەیشت. بەلایەوە گرنگ نەبوو، تەنانەت وەڵامی پرسیارەکانی هانسیشی نەدەدایەوە. ئەو هەربەردەوام بوو لە گێڕانەوەی ژیان. ئەو ژیانەی بۆی ناگەڕێتەوە دواوە.

بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەو ساتە بوو، کە هەتاو هۆشی دێتەوە سەرخۆی. بڕیاری دابوو، ئەم جارە هەرچی سنووری شەرم هەیە دەیسڕیتەوەو ڕێگا بەو دوودڵییەی هەتاو نەدا کە ژیانیان لێ تێکبداتەوە. ئەو لەبەرخۆشەویستی هەتاو گەیشتە ئەم وڵاتەو کارەکە و خێزانەکەی جێ هێشت. ئەم هەموو ساڵە ئامادەنەبوو کەسێک بهێنێتە ژیانییەوە. خەونی ئەو هەتاو بوو. تامەزرۆی ئامێز و ماچی هەتاو بوو، هەزاران شەوان بە خەیاڵی ماچ و ئامێزەکانی هەتاوەوە خەوی لێدەکەوت. بۆیە زۆر جار سنووری نێوان خەوو خەیاڵ و ڕاستی نەدەزانی. جاران هەر بەخەیاڵ لەگەڵیدا بووە، ئێستا لەگەڵیدا دەژییەت و هەموو ڕۆژێ دەیبینێ، بەڵام هیچ شتێک لە خەیاڵەکانی خۆی ناخاتە سەر واقیع. خۆشی نازانێ چاوەڕوانی هەتاو بکات، یان ئەم دەبێت دەستپێشخەری بکات. ئەم ئەو ئازایەتییە لە خۆیدا شک نابات، نە ئێستا و نە کاتی گەنجێتی. گەر ئەو کاتە گوڕو تینی بدایەتە بەرخۆی و دڵی بکردایەتەوە بۆ هەتاو، ئەوا ڕەنگە کەسیان ئەمەیان بەسەرنەهاتایە و ڕەوتی ژیانیان بە جۆرێکی تربووایە. کەسیش نازانێ بۆ ئەوە ڕوویدا، مانای ئەو ڕووداوانە چییە لە ژیانماندا. بەپێی بۆچوونەکانی بودیزم هەموو شتێ لە ژیاندا ڕوودەدات مانایەکی تێدا هەیە. ئەی دەبێت مانای ئەم هەموو ئازارانە چییە کە نەورۆز لە ماوەی ئەم هەموو ساڵانەدا چەشتوویەتی. لەگەڵ ئەو خۆشەویستییە گەورەیەی هەموو ژیان و تەمەنی داگیرکردووە،

کەچی نە جاران و نە ئێستا توانای دەربڕینی ئەو خۆشەویستییەی نییە.
نەورۆز هانسی برد بۆ قوتابخانەو خۆی چووە لای هەتاو. ناوچەوانی، چاوەکانی ماچ کرد. دەستەکانی خستە ناو دەستییەوە وتی: هەتاو دەزانی ئەمڕۆ کوڕەکەت داوای لێی کردم باسی منداڵی خۆمی بۆ بکەم. بەڵام ئێستا گوێبگرە ئازیزم بۆ تۆی باس دەکەم. هیوادارم بتوانم ڕۆژێ باسی خۆشەویستی خۆمت بۆ بکەم. بڵێی ئەو ڕۆژە بێت دڵەکەم. بەڵێنت پێدەدەم ئەمجارە وشەی شەرم لە فەرهەنگی خۆمدا دەسڕمەوە. ئەمجارە هاتیتەوە بۆ لامان، پەردەکانی نێوانمان لادەدەمەوەو دەبێت ئارەزوو و هەستە شاراوەکانم بە ڕووتی ببینی.

کەمنداڵبووم زۆرحەزم دەکرد لە هاویندا سەردانی ماڵی خاڵم لە سلێمانی بکەم. ئێواران حەوشەی ماڵی خاڵم کە پێشتر ماڵی باپیرەم بووە، ئاورشێندەکراو خۆشترین شوێنیش ئەو چرپا کۆنە بوو کە بە چەند پارچە تەختەی کۆن داپۆشرابوو، دۆشەکێکی لۆکەشی لەسەر ڕاخرابوو. هەموو هاوینێک لە هەمان شوێن لە حەوشەکەدا ئەو حاڵە نەگۆڕەبوو کە تائێستا وەک دیمەنێکی لەبیرنەکراو لە خەیاڵمدا تۆمارکراوە. باڵەفرەی ئەو کۆترە سپییە بچوکانەش کەلەهەیوانەکەدا بوون سەرنجی ڕادەکێشام. بەردەوام خاڵم دەیوت ئەو کۆترانە وەستایەکی بیناسازی بانەیی فێریی زۆر شتی کردوون. ئەم کۆترانە لە مرۆڤەکان دڵسۆز ترن، لەهەرکوێ هەڵیان بدەی دێنەوە لات.

لەو ماڵەدا گەنجینەیەکی تاریک هەبوو. ئەگەر لە دەرەوە بچویتایە ژوورەوە بۆ چەند چرکەیەک بەرچاوی خۆتت نەدەبینی. ئەو کاتە تەمەنم پێنج ساڵان بوو. ئێواران لەسەر چرپایەی حەوشەکەدا پاڵم

دەدایەوەو تەماشای ئاسمانم دەکردو ئەو باڵندانەم بۆ نەدەژمێردرا کە پۆل پۆل ئاسمانیان داگیرکردبوو. هەرگیز ئەو باڵندانەم لە شارەکەی خۆم نەبینبوو. کاتێک پرسیاری ناوی ئەو باڵندانەم کرد وتیان پێی دەڵێن (تەیرە ئەبابیلە). ئەو کاتە نەمدەزانی لەقورئاندا ئاماژە بۆ ئەو باڵندەیە کراوە.

بە منداڵی زۆر حەزم لەیاری چاوشارکێ دەکردو زۆر جار لەو گەنجینەیەدا خۆم دەشاردەوە. کاتێک بە منداڵی یاری چاوشارکێم دەکردو لەو گەنجینەیەدا خۆم دەشاردەوە، نەمدەزانی بە گەورەیی هەمان ئەو خۆشاردنەوەیە دەکەم بەڵام نەک وەک یاریو گەمەکردن، بەڵکو وەک پاراستن لە خودی خۆم.

یادگاریم زۆرە، تەمەنم یانزە ساڵ بوو، جارێک یاری چاوشارکێم لەگەڵ خالۆزاکانمدا دەکرد. دەمزانی ئەو گەنجینە تاریکە باشترین شوێنی خۆشاردنەوەیە. کوڕی خاڵەکەم دەستی کرد بە بژاردن یەک... دوو.. سێ... . بە هێمنی دەرگاکەم کردەوەو خۆم خزانە سوچەکەوە. ئەو سوچە باشترین شوێنی خۆشاردنەوە بوو. نەمزانی چۆن کەوتمە باوەشی کچە خاڵەکەم کە دوو ساڵێ لەمن گەورەتربوو، کەوتم بەسەریدا و دەستم بەر هەردوو مەمانی کەوت. هەردووکمان بێدەنگ بووین، نە ئەو قسەی کرد و نە من دەستەکانم جوڵاند. بە هێمنی بەرەو لای خۆیی ڕاکێشام و چرپانی بە گوێمدا وتی «بێدەنگ بە، با پێمان نەزانن»ئەوجا لێوەکانی بەرەو لای ڕوومەت و لاملم و دەمم هێنا، ماچیکردم، منیش ئەوم ماچکردەوە، نەمزانی بۆ ئەو کارەم کرد بەڵام هەستم بە خۆشییەک کرد. بۆیە حەزم نەکرد کەس بەو ناوەدا بێت. ترسی ئەوەشم لێنیشت کەسێک پێمان بزانێ. گوێمان لە ترپەی پێیەک دەبوو، بە ئەسپایی لێمان

نزیک دەکەوتەوە، لێک دووردەکەوتینەوە، کچەکەی خاڵم بە هێواشی شوێنەکەی خۆی گۆڕی. کاتێ دەنگی هەنگاوەکە دووردکەوتەوە، خێرا دەهاتەوە لام و جەستەی بە جەستەمەوە دەنووساند و دەمی دەخستە ناو دەممەوە. یاری چاوشارکێ فێری گەرمی ماچ و باوەشی کچانی کردم. بۆیە بڕیارم داوە کە منداڵم بێ، پێش هەموو شتێ فێری یاری چاوشارکێی دەکەم. پاش تەواوبوونی یارییەکە ماوەیەک کەسمان ڕوومان نەدەهات تەماشای یەکتربکەین. پێش ئەوەی لەگەڵ دایکمدا بڕۆمەوە، هاتە لامەوە وتی، بیرت نەچێت ئەوەی کردمان یاری بوو، نەک ڕاستی. ئەو یارییەش پێی دەڵێن ماچماچێن. ئەو یارییە هەر لە تاریکایی و بە دزییەوە دەکرێ، یارییەکە گەورەکان نابێت پێبزانن. کە گەورەش بووم یاری لەو بابەتانەم زۆرکرد، بەڵام نە لە تاریکایی و نە بەدزیی گەورەکانەوە. بەڵام هیچ یەکێ لەو یارییانەی تەمەنی گەنجێتی هەمان چێژو تامی ئەوەی ناو گەنجینەکەی نەبوو.

پاش چەندان ساڵ گەرامەوە هەمان گەنجینە، ئەمجارەیان نەیاری چاوشارکێم دەکرد نە دەستبازی لەگەڵ کچە خاڵەکەمدا، ئەو کاتە ئەو شووی کردبوو و منداڵێکیشی ببوو. ئەمجارەیان خۆمم لە هێزێکی تاریکپەرست شاردەوە. زۆرجار دەمووت بۆ دەبێت خۆمیان لێ بشارمەوە. خۆ من لە مردن ناترسم، بەڵام هەستێکی وام لا دروستبوو کە من کاتی مردنم نەهاتووە. چاوەکانم دەنوقاند خۆمم وەک زۆر شت دەبینی، خۆمم وەک پێشمەرگەیەک دەبینی، وەک عاشقێکی بێدەنگ، وەک باوکێکی بەسۆز، وەک پەڕاهەندەیەک، خۆمم لەم خەستەخانەیەدا دەبینییەوە کە ئێستا بووەتە مزگەوت وهەموو ڕۆژێ لەو خوایەی بڕوام پێی نییە دەپاڕێمەوە و داوای لێدەکەم یارمەتیمان بدات و هۆشت بێتەوە سەرخۆت . زۆر سەیرە مرۆڤ لە ساتە سەختەکانی

ژیانیدا بەدوای هێزێکی نادیاردا دەگەڕێ تا هانای بۆ ببات. دڵنیاش بووم لەوەی داهاتووم ڕووناکە، هەر ئەو کاتە دەمزانی لێشاوێک ڕووناکی بەدوامەوەیەو جێمناهێڵێ ، دوایش بۆم دەرکەوت ئەو هێزە خۆشەویستی دایکمە.
ڕۆژێکیان هێزەکانی ڕژێم ئەو ناوەیان هەموو گرت، هەستم کرد ترسێکی زۆر هەموو جەستەمی داگیرکرد. خۆشم تێنەدەگەیشتم بۆچ وا دەترسم، گەر کەسێ لە مردن نەترسێ بۆ دەبێت لە گرتن و ژیانی ناو زیندان بترسێ. پاشان دڵخۆشی خۆمم دەدایەوە دەمووت لەبەر دایکم، لەبەر ئەو خەوانەی دەیبینم، لەبەر ئەو کچەی خۆشم دەوێت، لەبەر منداڵەکانی داهاتووم، نامەوێ بگیرێم و دەست دوژمن بکەوم. نەمدەویست لەو ماڵەدا دەستگیرم بکەن، دەمزانی نەک تەنیا من بەڵکو هەموویان ڕاپێچی زیندان دەکەن. پاش ئەو ڕۆژە شوێنم گواستەوە و چوومە ژێرخانەکەی ماڵی پوورم. لەوێدا زیاتر هەستم بەهێمنی دەکرد، ئەو ژێرخانە زۆر تاریک و نسرم بوو، لەبەرئەوەی دراوسێ هەست بەبوونی کەسێک نەکەن، پوورم پەنجەرەکانی لەدەرەوە بە نایلۆن داپۆشیبوو. ئەو ژێرخانە تاریکە جۆرە هێمنییەکی بەمن بەخشیبوو، ئەو ماوەیە خەریکی خوێندنەوە بووم، بەبێدەنگی کارەکانم ئەنجام دەدات. ئێوارەیەک هاتمەوە ماڵەوە، پوورم زۆر شپرزە دیاربوو. منیش نیگەران بووم. لەگەڵمدا هاتە ژێرخانەکەوەو وتی «کوڕم دەزانی ئەمڕۆ هەموو ئەم ماڵانەیان پشکنی، هەر باشبوو زوو فریاکەوتم شتەکانی تۆم لە شوێنێکی باشدا شاردەوە». پوورم لە ئامێزگرت و دەستەکانیم ماچکرد و وتم»پووری گیان، زۆر سوپاس بۆ تۆ، من حەز ناکەم لەوە زیاتر بتخەمە دڵەڕاوکێ و مەترسییەوە، بڕیارە سبەی بەیانی زوو من بەرەو شارەزوور بڕۆم، هەموو شتەکان بەباشی ڕێکخراوە«.

ڕەنگی پورم زەرد هەڵگەڕا. نەیدەزانی چیم پێ بڵێت. دەیزانی کە باسی شارەزوور دەکەم مەبەستم ئەوەیە بەیەکجارەکی شار جێدەهێڵێم ودەبمە پێشمەرگە. ژیانی پێشمەرگایەتی ڕێگای هاتو نەهاتە. لە هەمان کاتدا ئەگەر لە شاردا بمێنمەوەو خەریکی کاری نهێنی بم دیسانەوە ژیانم لە مەترسیدایە. زۆر جار پوورم پێی دەوتم واز لەم جرتوفرتە بێنەو تۆ بەو نازدارییە بە خێوکراویت کەی شەرەشەقی سیاسەتت پێدەکریت. بەردەوام پێی دەوتم لە بیرت چوو کە منداڵبویت ئێمە جگە لە دایکت بە چوار ژن تەنها تۆ تاقانەمان بوویتو لە باوەشماندا نەدەهاتیتە خوارەوە. لە بیرتە بۆ یەکەمین جار چویتە قوتابخانە پورە گەورەکەت ئەهدی ئەوەی کردبوو خۆی لە دەوری قوتابخانەکت بگێرێو وەک تەوافی کەعبە چەندین جار بە دەوری قوتابخانەکەدا دەسوریایەوە.

¬هەر ئەو ئێوارەیە، ئاسمان تاریکو ڕوون بوو، لە دەرگا درا. شێوازی لە دەرگادانەکە لە هی دراوسێکان دەچوو. من زۆر جار بە شێوازی لە دەرگادانو گوێگرتن لە خشپەی پێو پێڵاو خەڵکم دەستنیشان دەکرد. لەگەڵ لێدانی دەرگا ڕاستەوخۆ چوومە خوارەوە، وەک هەموو جارێکی دیکە بۆ ئەوەی دراوسێکان هەست بە بوونی من نەکەن. زۆری پێنەچوو گوێم لە ترپەی پێی یەکێک بوو، لە قادرمەکان دەهاتە خوارەوە. دڵم خێرا لێیدەدا، بە ئەسپایی دەرگاکە کرایەوە و بینیم دایکمە. خێرا فرمێسکەکان بە چاومدا هاتنە خوارەوە. بۆ ساتێ نەمتوانی بیربکەمەوە، لەبەرئەوەی ئەو ئێوارەیە من بیرم لە دایکم دەکردەوەو دەمووت خۆزگە ئێستا کەسێک دەبوو، دایکمی ئاگاداردەکردەوەو پێش ڕۆیشتنم بمبینیایە. خۆزگە ئێستا هێزێکی سیحریم دەبوو، برووسکەیەکم بۆ دڵی دایکم بناردایەو داوام لێبکردایە بێت بۆ لام، خۆ گەر جارێکی دی نەیبینمەوە لەخۆم خۆشنابم. ئا لەو ساتەدا بوومە منداڵیکی سێ ساڵان بە پێی

پەتی و بەخێرایی بروسکە هەستامە سەرپێ و باوەشم بە دایکمدا کرد. نەمدەویست بەری بدەم، ترسی ئەوەم هەبوو جارێکی دی لەو باوەشەدا ئارام نەگرم. فرمێسکەکانی هەردووکمان تێکەڵبوون، هەستم کرد ترپەی دڵی هەردووکمان لەیەک کاتدا لێ دەدا. پێکەنینەکەی پوورم هۆشی هێنامەوە. هەدووکمان فرمێسکەکانمان سڕی و هەموو پێکەوە چووینە ژووری دانیشتنەکە.

من هەمیشە خۆشەویستییەکی تایبەتیم بۆ دایکم هەبوو. لە هیچ کاتێکدا بەو ڕادەیە باوکمم خۆشنەویستووە. پەیوەندیشم لەگەڵ باوکمدا هێندە باش نەبوو. دەمزانی باوکم خۆشی دەوێم بەڵام خۆشەویستییەک، ئازادییەکانی زەوت دەکردم، گیانی قایل بوونی تێدا دەچەسپاندم. من ئەو خۆشەویستییەی باوکمم پێ قەبووڵ نەبوو، ئەمە جگە لەوەی ئەو مێردێکی میهرەبان نەبوو بۆ دایکم. هەرگیز فرمێسکەکانی دایکمم لە یاد ناچێت. هەردەم ئەو فرمێسکانەی هۆن هۆن بە چاوەکانیدا دەهاتنە خوارەوە، وێنە پڕخەمەکەی چاوەکانی وەک تابلۆیەکی بە هاوار بە دیواری عەقڵمدا بۆ هەمیشەیی هەڵواسراوبوو. باوکم بەرپرسیاربوو لە هەموو دڵۆپێکی ئەو فرمێسکانە. هەردەم دەمگووت باوکم تەختەیەکی نوقسانە. باوکێک لە نێو خەڵکدا بە پیاوماقوڵو ڕدێن سپیو چارەسەرکەری گرفتە کۆمەڵایەتییەکان، ناسراوبوو کەچی لەماڵەوە کەسایەتییەکی دیکە بوو. کەسایەتییەک لە سادەترین گرفتی ماڵەوە بە شەقو زللەو تێهەڵدان لە گەڵ ئێمەوو دایکمدا مامەڵەی دەکرد. بۆیە من هەر لە منداڵییەوە لە سەنگەری دایکیمدا بووم. لەگەڵ فرمێسکەکانی دایکمدا منیش لە ناخەوە دەگریام. بەڵام بەدزییەوە، باشترین کاتیش بۆ ڕشتنی ئەو فرمێسکانە شەوان بوو یان کاتێ دارلاستیکەکەم دەگرتە دەست و دەچوومە سەربان و لەپەنا دیواری هەورەبانەکەماندا دادەنیشتم و

بیرم له دڵڕەقی باوکم دەکردەوە. چۆن دڵی دێت، وا له ئێمه و دایکم بدات. ئاڵەو ساتانەدا ئاواتەخوازبووم که من کوڕ نەبوومایە. ترسی ئەوەم لێ نیشت که گەورەبم وەکو ئەوم لێدەرچێت. لەو ساتەوە نەک خەمی فرمێسکەکانی دایکم وەک سێبەر بەدوامەوەبوو بەڵکو ترسی ئەوەی مێردێک و باوکێکی وەک باوکم لێدەرچێ هەردەم وەک سێبەر بەدوامەوەبوو. بۆیە زۆر جار له سەربان دەخەوتم، ئاسمانم دەکردە شانۆو خۆم دەبوومە باوکێکی میهرەبان و مێردێکی بەسۆز. ژنەکەم له ئامێزدەگرت و ماچم دەکرد و منداڵەکانم دەبردە دەرەوەو یاریم بۆ دەکڕین و دیاریم بۆ ژنەکەم دەکڕی. جارێک له یادمه چوومه بازاڕ و دوکان بەدوکان دەگەڕام تا بڕیاربدەم چی بۆ منداڵەکانم بکڕم و چی بۆ ژنەکەم بکڕم. لەبەردەم دوکانێکی زێرفرۆشدا چاوم بەر ملوانکەیەکی زۆر جوان کەوت. لەبەردەم دوکانەدا ماوەیەکی زۆر ڕاوەستام و چاوم بڕیبووە ملوانکەکەو خەیاڵم لەوە دەکردەوە کاتێ ئەو ملوانکەیە بۆ ژنەکەم دەکڕم و دەیبەمە ماڵەوەو له ملی دەکەم، دەبێت چەند دڵخۆش بێت. دڵنیابووم لەوەی ماچم دەکات و لەئامێزم دەگرێ. لەناکاوا دوکاندارەکە نەڕەیەکی بەسەرداکردم و منیش تا توانام هەبوو ڕامکرد. له یادمه تەمەنم نزیکەی چوارده ساڵ بوو، نەمزانی لەبەرچی بوو باوکم پری دایه دایکم و دایکیشم به هەردوو لەپی دەموچاوی داپۆشی و له نێوان پەنجەکانییەوە نیگاکانی کرده من و ئەو نیگایانه هێزێکی سیحراوی پێبەخشیم و وەک پڵنگ پەلاماری باوکمم دا و دەستەکانیم گرت. هاوارم کرد بەسەریدا و وتم»بەسه ئیتر تاکەی لێمان دەدەی»ئەو کاته دەنگم گڕ ببوو، بەڵام وا هەستمکرد گڕی دەنگم و هێزی پڵنگ ئاسام باوکمی هەژاند. منیش ئەوەندەی له ژیانمدا مابێتم شانازی بەو ساتەوە دەکەم بەهانای دایکمەوە هاتم. هەر لەو ڕۆژەوە پەیوەندی من و دایکم و هەموو ژنەکانی ناو ژیانم گۆڕا. بەردەوام هەستمدەکرد

من هەرگیز ناتوانم ببمە سەرچاوەی ئازاری ژنان. من ئەو بڕیارەم دا ئامادەشم ژیانم بۆ ئەو مەبەستە تەرخان بکەم.

من هەردەم هەستم دەکرد خۆشەویستی دایکم هێزێکی بێ سنوورو بێ هاوتای پێدەبەخشیم، تەنانەت لە سەختترین ساتەکانی ژیانی پێشمەرگایەتیدا لە دڵمدا جێگای ترس نەدەبووەوە. هەستم دەکرد هێزێکی شاراوەی خودایی لە دڵو چاوی دایکمەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ پاسەوانیم دەکاتو دەمپارێزێت.

ئەو شەوە سەر لە بەیانی سەعات چوار هاورێیانم بە دوامدا هاتن بۆ ئەوەی بە نهێنی لە شار دەربازم بکەنو بمگەیەننە ناوچەی دەسەڵاتی پێشمەرگە. ئەو شەوە وەک منداڵەکەی جاران لە ئامێزی دایکمدا بووم، بەڵام نە من نە دایکم نەنووستین.
پێش ئەوەی بڕۆم دایکم بە پێکەنینەوە وتی «دەزانی لەو گەنجینەیەی تۆ خۆت شاردۆتەوە خاڵت لە لاوێتیدا نامەو ڕۆژنامەی نهێنیو تایپی تیادا دەشاردەوە، منیش کاری پەیامنێریم دەکردو نامەی ڕێکخستنەکانم بۆ خاڵت دەهێنا.

ئەوە یەکەمین جار بوو دایکم ئەو نهێنییە بدرکێنی، نەمزانی بۆچی پێشتر ئەو نهێنییەی نەدرکاندوە؟ تۆ بڵێی مەبەستی ئەوە بووبێت من لە کاری سیاسی دورخاتەوە یان لە ترسی باوکم بووبێت. بە هەر حاڵ دوور لە چەمکەکانی فەلسەفەو لۆجیک دایکم بە زمانێکی سادە پێی گووتم مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە.

کاتژمێر چواری بەیانی جلوبەرگی کوردیم لەبەرکردو تێرتێر دایکمم

ماچکرد. هەستم کرد دایکم لە ناخەوە دەگری و فرمێسکەکانی ڕووبارێکی پڕ دلۆڤانیو میهرەبانیو خۆشەویستییە. بێ ئەوەی دلۆپە فرمێسکێکی دایکم ببینم، هەستمکرد تەڕایی ئەو فرمێسکە نوقمم دەکات.
نەورۆز گوێی لە دەنگی پێی کەسێ بوو هۆشی هاتەوە سەرخۆی. هەستی کرد ماوەیەکی زۆرە باسی خۆیی دەکات و نەشیزانی لەکەیەوە ئەو کەسە لەوێیە. ترسی ئەوەی لێنیشت ئەو گوێی لە قسەکانی ئەم بووبێت. لای کردەوە، بینی پیاوێکی قژ ڕەش، ورگێکی زلی پێوەیە و زۆر بەوردی دەیڕاونییە هەتاو. بە بیری نەدەهات گەر لەم شارە ئەم پیاوەی بینیبێ. تەماشای کردەوە هەستی بە نیگەرانییەکی زۆر کرد. هەستاو بەرەو ڕووی ڕۆیشت. خێرا پیاوەکە لە چاوترووکانێکدا ونبوو. نەورۆز هەستی کرد ماوەیەکی دوورو درێژە لەناو یادگارییەکانی خۆیدا نقوم بووە. بۆیە ئاگای لێنەبوو کەی ئەم پیاوە هاتووەتە ژوورەو ناشزانی چۆن کە دەرگاکەی کردوەتەوە ئەم گوێی لێنەبووە. لەوەش دەکات ئاگای لەکات نەمابێ، تەنانەت بیری نەمابوو بچێت بە شوێن هانسدا. ئەو خۆی پاش قوتابخانە هاتە لای دایکی. هانس بینی نەورۆز لای دایکی دانیشتووە، خێرا هاتە باوەشیەوە دانیشت و دەستی کردە ملی. هانس هەستی بەبێ دەستەڵاتی خۆی بەرامبەر دایکی دەکرد. نەورۆزیش تاقە کەسێکە بتوانێ پەنای بۆ ببات. ئەو هەرگیز لەوە نەدەگەیشت بۆ دایکی خۆی لەهەموو جۆرە پەیوەندییەک لادەدا و دایکی هاوڕیی زۆر کەمە. لەو کاتەی نەورۆز هاتە سوێد تا ڕادەیەکی زۆر ژیانیان گۆڕا، لەگەڵ ئەوەی نەورۆز لەگەڵیاندا نەدەژییتا بەڵام ڕۆژانە دەهاتەماڵیان و زۆربەی کات پێکەوە نانی ئێوارەیان دەخوارد. لەوەتی دایکی لە کۆمادایە هەردووکیان زۆر لەیەک نزیک بوونەتەوە و هانس زیاد لەجاران هەست بە نزیکی و گەرمی نەورۆز دەکات. زۆر

جار ئاواتەخوازە ببێتە زڕباوکی. زۆر جار ئەمەشی لای هاوڕێکانی خۆی باس کردووە. ئێستاش ئەو بوارەی بۆ خولقاوە و زیاتر نەورۆز لە ژیانیاندا دەردەکەوێت. هەموو ڕۆژێ ئەو دەیبات بۆ قوتابخانەو ئەو دەیهێنێتەوەو پاشان پێکەوە خواردن دەخۆن و دەچنە لای دایکی. ئێستاش پێکەوە خۆیان دەشۆن. کاتێ نەورۆز هانسی شۆرد و وشکی کردەوەو جلەکانی لەبەرکرد هانس ئاواتی دەخواست ئەمە دواجار نەبێت، نەیزانی چۆن ئەم پرسیارە بە مێشکیدا هات و پرسی:

. تۆ چۆن دایکمت ناسی؟

نەورۆز پێکەنی وتی:

. دەمێکە، هێشتا تۆ لەدایک نەبووبوویت، خۆ دەزانی دایکت خەڵکی کوردستانە، لەو کاتەی دایکت لە زانکۆ دەیخوێند یەکترمان دەناسی. من دایکتم زۆر خۆشدەویست. واتە من عاشقی دایکت بووم، دەزانی عاشق بوون مانای چییە؟. بەڵام من باسی ئەو خۆشەویستییەم بۆ دایکت نەکرد. هەر چاوەڕوانی هەلێکی گونجاوبووم. ئەو فرسەتەم هەردەست نەکەوت. تا ڕۆژێک بیستم دایکت شوودەکات و دەچێت بۆ سوێد و واز لە خوێندنەکەی دەهێنێ. دایکت بۆی باس نەکردووی بۆچ شووی کردو هاتە ئێرە؟.

. نا هەر ئەو دەڵێت کە گەورەبووی هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم، ئیتر نازانم کەی ئەو من بە گەورە دەزانێ.

. دیارە دایکت باشتر ئەمە دەزانێ. من زۆر هەوڵمدا لەگەڵیدا و زۆر قسەم لەگەڵ دایەگەورەت کرد تا ئەو کارە ئەنجام نەدەن، ئەو کەسەی دایکت شوی پێکرد پیاوێکی خراپ بوو. دایکت وازی لێهێنا، ئازاری دایکتی زۆردا.

. من دەزانم ئەو باوکم نییە، هەرباشە ئەو باوکم نەبووە، دایکم باسی ئەوە دەکات ئەو و باوکی من زۆر یەکترییان خۆش ویستووە،

بەڵام باسی ئەوەی بۆ نەکردووم بۆچ لە یەکتردابڕان، لەوەش ناگەم بۆ پەیوەندییان بەیەکەوە نییە، من دوو برادەرم هەیە دایکوباوکیان لەیەک جیابوونەتەوە کەچی هەر پەیوەندییان پێکەوە هەیەو ئەوان لای هەردووکیان دەژیێتن. منیش حەزم دەکرد لای هەردووکیان بژیم. دەزانم باوکم لێرە ناژی، بەڵام هەردەمتوانی بچم بۆ لای. من ئەو شەوە بوو، زانیم باوکم لە ستۆکهۆڵم دەژییێت، بۆیە بڕیارمدا بچم بۆ ئەوێ و بیدۆزمەوە. من نەدەبووایە کاری وام بکردایە. ئەگینا دایکم نەدەکەوت و وای لێنەدەهات. باشە ئێمە چی بکەین گەر دایکم هۆشی نەیەتەوە سەرخۆی؟ .

ـ هەر دێتەوە سەرخۆی. خەمت نەبێت. هەردووکمان دەتوانین یارمەتی بدەین بێتەوە سەرخۆی، شتی وا زۆر ڕوویداوە.

ـ دایکم دەڵێت ئەو باوکمی زۆر خۆش ویستووە، ئەی ئەگەر هەوڵدەین باوکم بدۆزینەوە و بێت بۆ لای. لەوانەیە زوو هۆشی بێتەوە سەرخۆی.

نەورۆز بێدەنگبوو، پێشنیارەکەی ڕاستیەکی تێدایە، ئەی باشە چۆن ناونیشانی بدۆزێتەوە، کاتێ نازانێ پاشناوەکەی چییە؟!

ـ نەورۆز تۆ ناڵێی تۆ دایکمت زۆر خۆش ویستووە، دەی دەی باسی ئەوەی بۆ بکە، دەی بۆ پێدەکەنی، خۆ شەرم نییە گەر یەکێکت خۆشبوێ، دەی باسیکە.

ـ یەکەمین جار دایکتم لە یانەی کۆلێژ بینی. ئەو ساڵی یەکەمی بوو، منیش ساڵی چوارەم. ڕۆژێ چەند قوتابییەک بووین لە یانە دانیشتبووین، دەستی بۆ ڕاکێشام تا تەوقەم لەگەڵدا بکات و وتی ناوم هەتاوە. گەرمییەک وەک تیشکی هەتاو هەموو جەستەمی داگیرکرد. ئەو ئێوارەیە لە تەنیشتییەوە دانیشتم و نەمدەویست لە جێگەی خۆم بجوڵێم. هەردووکمان شەرمن بووین. زۆر هەوڵم دا قسەی لەگەڵ بکەم. ئەو بە

وشەیەک و بزەیەکی کورت وەڵامی دەدامەوە. هەموو ڕۆژێ دەبووایە بمبینییایە. هەرجارەو هۆیەکم بۆ دەدۆزییەوە. لەبەرئەوەی نەمدەوێرا باسی خۆشەویستی خۆمی بۆ بکەم، لە سەرەتاوە دەمویست دڵسۆزی خۆمی نیشان بدەم. ئەویش لە ڕێگەی کتیب و مەلزەمە پەیداکردنەوە بۆی. هەروا لە بابەتەکاندا زۆر یارمەتیم دەدا. ئیتر وای لێهات هەموو ڕۆژێ یەکتریمان دەبینی. هاوڕێکانم هەستیان بەم هەستەی من کرد بەرامبەر بە دایکت، زۆر گاڵتەیان پێدەکردم و دەیانووت گەر پەلە نەکەی و دڵتی بۆ نەکەیتەوە، ئەوا لە دەستت دەچێت. دایکت وەک ئێستا هەر جوان بوو، لە چاوەکانیدا هەستت بە هێمنی و خۆشەویستییەکی زۆر دەکرد. دوایی زانیم ئەم هێمنییەی دایکت لەو خۆشەویستییە قوڵەی نێوان بابەگەورەو دایەگەورەتەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ، بابەگەورەت دایکتی زۆر خۆش ویستووە. ئێستا دەزانم ئەو منداڵانەی لە سایەی خۆشەویستیەکی هارمۆنی گەورەدەبن، وەک دایکت ئەو گەرمییە لە چاوەکانیاندا بەدی دەکرێ. دایکت لەگەڵ هەموو قوتابیاندا پەیوەندی باشبوو، زۆر لە کوڕەکان لە دەوری بوون. ئەمەش دوو دڵی و ترسێکی لە دەروونی مندا دروستکرد کە نەوێرم دڵی خۆمی بۆ بکەمەوە. هەروا من ئەو کاتە کەسێکی سیاسی بووم، دژی ڕژێم لە ڕیزی حزبێکی بەرهەڵستکاردا کارم دەکرد. ئەو مەترسییەشم هەر لە دڵدا هەبوو. گەر من پەیوەندیم قوڵبکەمەوەو ئەو بکەمە دەستگیرانم، گەر بگیرێم، لەوانەشە ئەویش تووشی دەردەسەری بێت و لەوانەیە ئەویش بگیرێ. بۆیە هەستەکەم بە ماتی و نتمی مایەوە. پاش ساڵێ من ناچاربووم واز لە کۆلێژ بێنم و ڕووبکەمە شاخ بۆ پێشمەرگایەتی. من لەناکاوا ون بووم، بەبێ ئەوەی هیچ شتێ لای ئەو بدرکێنم. ئەو شەوەی کۆلێژم جێ هێشت چەند جارێ نامەم بۆ نووسی و باسی خۆشەویستی خۆمم بۆدەکرد، پاشان نامەکەم دەدڕاند. لەوانەیە تا دەمەوبەیان زیاتر لە

سی نامەم نووسیبێ. پاشان بۆم دەرکەوت ئەم هەستەی من بە وشە دەرنابڕێ، بەڵکو ئامێز و ماچ وتێکەڵبوون تاقە ڕێگەی تەقینەوەی ئەو هەستە بەهێزەیە. هەندێ جاری تریش دەمووت وا من دەڕۆم بۆ پێشمەرگایەتی و نازانم دەتوانم بگەڕێمەوە یان نا کێ دەڵێ پاش ماوەیەک شەهید نابم. بۆ ئەم کچە دەستخەرۆ بکەم، یان دەمووت کێ دەڵێ ئەو منی خۆشدەوێت. شەهید نەبووم، پاش ڕاپەڕین گەڕامەوە، ئەو لە خوێندن بەردەوامبوو، منیش لەهەمان پۆلی ئەو دەستم کردەوە بە خوێندن. ئەوکاتە بۆ یەکەمین جار منی بینی شاگەشکەبوو لە خۆشییدا و بێ شەرم لە ئامێزی گرتم. ئەوکات دایکت جلی ڕەشی لەبەردا بوو، لەبەرئەوەی دلێری برای لە ڕاپەڕیندا شەهیدبوو. دایکت وابزانم باسی ڕاپەرینەکەی بۆ کردووی. دایکت زۆر خەمگین بوو. کە شەوان دەخەوتم بڕیارم دەدا سبەی باسی خۆشەویستی خۆمی بۆبکەم. کەچی بۆ بەیانی دەمم دەبووە تەڵەی تەقیوو. دەمویست باسی ئەوەی بۆ بکەم چۆن ئەم چەند ساڵەی کە لێوەی دووربووم ئەو بەردەوام وەک سێبەر لەگەڵمدا بووە. ئەو شەوانەی مانگ لە ئاسمان دەردەکەوت، دەچوومە سەربان و دەموچاوی ئەوم لە مانگدا دەبینی و بەردەوام نامەی خۆشەویستیم بە تیشکی مانگدا بۆ دەنارد. هەموو شەوێ لە ئامێزی ئەودا خەوم لێدەکەوت.

نەورۆز لەناکاوا بێدەنگ بوو، وا هەستی کرد زیادە ڕۆیی کردووە. ئەو قسانە هی ئەوە نین بۆ منداڵێکی هەشت ساڵان بکرێ، ئەو قسانەی کرد، دەبووایە دەمێک بوو بۆ هەتاوی بکردایە. هانس تەماشایەکی کرد و پێکەنی.
هاتە باوەشییەوە و دەستی کردە ملی و ماچیکی کرد.

## - 3 -

گەیشتمە ئەو باوەڕەی ڕێزان ژنێکی چاونەترس بوو. لەهیچ شتێک نەدەسڵەمییەوە. ئەو ژیانێکی نوێی دەست پێ کرد. دەستی بە کار کرد و منداڵەکانی لە قوتابخانە بوون. پاش ئەوەی لە مێردی دووەمی جیا بوویەوە، بەردەوام چاوی بەدوای پیاوێکدا دەگێڕا کە بەدڵی بێت. لە ماوەی ئەم شەش ساڵەی دواییدا چەند پیاوێکی ناسی. بەڵام هیچیانی بە دڵ نەبوو. هەندێ جار دەیگوت باشترە پیاوێکی سوێدی بدۆزمەوە، دوایی کە بیری لە جیاوازی کولتووری دەکردەوە پەشیمان دەبوویەوە. کاتێ بیری لە کوردێک دەکردەوە هەمدیسان پەشیمان دەبووەوە. ئەو دەیگوت پیاوە کوردەکان چەند ساڵیش لەم ئەورووپایەدا بژین هەمان عەقڵییەتیان هەیە و هیچ ناگۆڕێن. منیش تازە تاقەتی ئەوەم نەماوە شوو بەکوردێک بکەم شووڵم لێهەڵگری، بە ئارەزووی خۆی سنوورم بۆ دابنێ. بۆیە هەر بە تەنیا مابوویەوە و لەوەیشی دەکرد لە ژیانی ڕازی بێت. منداڵەکانی لە قوتابخانەدا زۆر زیرەک بوون و خۆشی لە کارەکەیدا سەرکەوتووبوو. زۆر گرنگی بە خۆی دەدا و بەپێی تازەترین مۆدە جلی لەبەردەکرد. تاقە کاتێک تێدا هەستی بە تەنیایی دەکرد شەوان بوو، کاتێ منداڵەکانی دەخەواند و پاشان بە تەماشاکردنی تەلەڤزیۆنەوە خۆی خەریک دەکرد. لەوەش بێزاربوو، پێشنیاری هاوڕێیەک، دەرگای بەرەو ڕووناکی لێی کردەوە. ئاڤێستا یەکێک بوو لە هاوڕێ نزیکەکانی، ماوەی چوار ساڵێک بوو لە سوێد دەژییتا. ئەو هەموو شتێکی لەسەر ژیانی ڕێزان دەزانی کەچی خۆی بە یەک وشە چییە باسی ژیانی خۆیی بۆ ڕێزان نەدەکرد. ڕێزانیش ئەمەی بەلاوە گرنگ نەبوو، بۆچوون و شێوەی بیرکردنەوەی ئاڤێستا یاریدەدەر بوو تا وا ژیان بە ئاسانی بگرێ. سەریشی لەوە سووڕدەما ئەم کچە چۆن لەماوەی ئەم چوار

ساڵەدا وا باش فێری زمانی سوێدی بووەو ئەم هەموو کون کەلەبەرەی ئەم وڵاتە شارەزابووە. ڕێزان تاقە هاوڕێیەکی کوردی ئاڤێستا بوو، هەموو هاوەڵەکانی تری سوێدی بوون، لەگەڵ ئەوانیشدا تێکەڵ بە دنیای ڕۆحیانەت ببوو. ئەو دەیگوت ئەمە تاقە ڕێگەیەک بوو منی لە کۆمەڵێ تراومە ڕزگارکرد، بەڵام هەرگیز باسی ئەوەی نەدەکرد ئەو بەچ تراومایەکدا تێپەڕیووە. ئەو هەموو ڕۆژێ دوو جار کاتی بۆ مێدیتەیشن تەرخان دەکرد. لە هەفتەیەکیشدا دوو جار یۆگەی دەکرد. زۆر جار بە زۆر ڕێزانی پەلکێشی یۆگەدەکرد. ڕێزان لەسەرەتاوە جگە لەوەی گاڵتەی بەوجۆرە شتانە دەهات و بڕوای پێینەبوو لەهەمان کاتیشدا هەرجارەی دەچوو لەبەر پێکەنین نەیدەهێشت نە خۆی و نە ئەوانەی لە گروپەکەدا بوون تەرکیزبخەنە سەر ڕاهێنانەکان. بۆیە ماوەیەک وازی لە یۆگا هێنا. پاشان خۆی فیلمێکی ڤیدیۆی کڕی و شەوان کە منداڵەکانی دەخەوتن، خۆی خەریکی ڕاهێنان کردن بوو. زۆربەی شەوان لەبەر پێکەنین بەخۆی نەیدەتوانی هیچ بکات. هەربەدەم پێکەنینەوە خەوی لێدەکەوت. بۆیە بەیانییان کە لەخەو هەڵدەستا هەستی دەکرد زۆر دڵی خۆشەو هەمووی جەستەی پێدەکەنێ. خۆشی نەیدەزانی بەهۆی پێکەنینەکەیەوەیە یان بەهۆی ئەو چەند جوڵە سەقەتەوەیە کە دەیکات و دەیەوێ لاسایی ئەو مامۆستایە بکاتەوە کە تەواو کەوتووەتە ناو ڕاهێنانەکانەوە. لەوە نەدەگەیشت چۆن ئەمانە دەچنە ناو خەڵوەتێکی واوە ئاگایان لە هیچ شتێ نامێنێ. ئاڤێستا هەموو جار پێیدەوت دەبێت لەو کاتەدا بیر لەهیچ نەکەیتەوە، باشترین ڕێگەش بۆ ئەمە ئەوەیە تەنیا بیرت لای هەناسەکانت بێت. هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشە و ماوەیەک بیوەستێنە، پاشان هەناسەکەت بدەرەوە. هەناسە مانای ژیانە، هەربۆیە سەرەتای چوونە ناوەوەی خۆت بیرکردنەوەیە لە هەناسەوەرگرتن و هەناسەدانەوە. ئاڤێستا زۆر جار هەوڵی لەگەڵ ڕێزان داوە، تەنیا

بیر لەهەناسەکانی بکاتەوە بەڵام ڕێزان دەیدایە قاقای پێکەنین و دەیگوت»ئەوەی ئاگام لێنەبوو هەناسەکانم بوو، بیرم لەوەکردەوە سبەی چ خواردنێ ئامادەبکەم و چۆن منداڵەکان خەبەرکەمەوە و بیانبەم بۆ قوتابخانە و سبەی خۆم چی لەبەر بکەم... ئەوەی لە کاتێکی ئاساییدا بیری لێناکەمەوە ئا لەم کاتەدا بیری لێدەکەمەوە». چەند هەفتەیەکی خایاند تا ڕێزان فێربوو بیر لە هەناسەکانی بکاتەوە. پاش ماوەیەک هەستی کرد قسەکانی ئاڤێستا هەموو ڕاستن، گەر ماوەیەکی کورتیش خۆی لە دەوروبەرو بیرکردنەوە ئازاد بکات هەست بە پشوویەکی دەروونی و جەستەیی دەکا. ئیتر ڕێزان نهێنی دۆزینەوەی ئارامیی دۆزییەوە. هەموو شەوێ کە منداڵەکان دەخەوتن، مۆسیقا تایبەتیەکەی خۆی دەخستە سەر و لە ژووری نووستنەکەیدا جێگایەکی تایبەتی دانابوو و پاشان مۆمێکی دادەگیرساند و خەریکی مێدیتەیشن دەبوو. ڕێزان پاش ئەو چەند ساتە کورتە هەستی بەهێمنی و خاوبوونەوەیەک دەکرد لە هەموو ماسوولکەکانیدا. هەروا هەستی بوونی هێزێکی پڕ ڕووناکی دەکرد، نەشیدەزانی لە کوێوە دەزێتە جەستەی. زۆرجار دەچووە قووڵایی خۆیەوە هەستی بە خەمێکی زۆر دەکرد و لە ناوەڕاستی مێدیتەیشنەکەدا بەکوڵ دەگریا. ئاڤێستا پێی وت»دیارە تۆ زۆر شتت لە خۆتا کۆکردوەتەوە، ئەوانە سەرچاوەی ئازار وخەمگینی تۆن. بۆیە بەهەر شێوەیەک بێت دەبێت سەرچاوەی ئەو ئازارانە بدۆزیتەوە، بۆ ئەوەی کار لە ژیانی خۆت و منداڵەکانت نەکا.»ڕێزان دەیزانی سەرچاوەی ئازارەکانی لە کوێدایە. بڕیاری دا هەموو شەوێ دانیشێ یادەوەرییەکانی خۆی بنووسێ، بۆ خۆی نەک بۆ بڵاوکردنەوە. نەیدەزانی لە کوێوە دەست پێبکات، لە کوردستانەوە یان لە سوێدەوە. باسی مێردی یەکەمی بکات یان دووەم، باسی سەرەڕۆی خۆی بکات یان ئازایەتی. ڕۆژێک نەبوو لە ژیانیدا بیر لە شارا و شیرین

ودەریا نەکاتەوە. ئەو سێ کەسە بەردەوام وەک سێبەر بەدوایەوە بوون. لەساڵی یەکەمدا پاش ونبوونی شیرین چەند جارێ پەیوەندی بە هانسەوە کرد، پاش ئەوە ئەو پەیوەندییەش پچرا چونکە هانس ژمارەی تەلەفۆنەکەی گۆڕیبوو. پێش ساڵێ هانسی لەگەڵ ژنێکدا بینی، دەبێت ژنەکەی خۆی بێت. دیارە پاش بێ هەواڵی شیرین گەڕاوەتەوە لای ژنەکەی خۆی. ئەو پاش ونبوونی شیرین باری دەروونی تێکچوو. ڕێزان دڵی دەدایەوەو داوای لێی کرد بە دوایدا بگەڕێ. ڕێزان بۆی باس کرد شیرین ئەوی زۆر خۆشدەوێت. ڕۆیشتنەکەی بەبێ هۆ نییە. هەروا ئەوەشی بۆ باس کرد ئەو ناوی هەتاوە نەک شیرین، لەترسی مێردی یەکەمی ناوی خۆی گۆڕیووە تا نەیدۆزێتەوە. لەگەڵ هەموو هەوڵدانێکی ڕێزان هانس هیچ کارێکی نەکرد. بەتایبەتی هەر لەو ماوەیەدا مەسەلەی خۆکوشتنی شاراش لە ڕۆژنامەکاندا بەشێوەیەکی بەربڵاو باسدەکرا. زۆر لە ڕۆژنامەنووسەکان لەو باوەڕەدابوون کە لەلایەن کەسوکارییەوە کوژراوە و کچەکەشی بێ سەروشوێن کراوە. ئەو هەموو ساڵە تێپەڕی کەچی شەو نەبوو ڕێزان بتوانێ خەوی لێبکەوێ بەبێ ئەوەی بیر لەوان نەکاتەوە. لەگەڵ هەموو ئەو نارەحەتی و ناخۆشییەی بینییان بەڵام کاتێکی خۆشییان بردە سەر. ڕێزان هەر بە هیوایە ڕۆژێ لە ڕۆژان هەتاو و دەریا بدۆزێتەوە. بەڵام نازانێ چۆن و کەی هەنگاو بەرەو ئەو مەبەستە دەنێت.

ڕێزان کە مەزاجی تێکدەچوو دەچووە لای ئاڤێستا یان ئاڤێستای بۆ لای خۆی بانگ دەکرد. کاتێ منداڵەکانی دەخەوتن بتڵێ شەرابی دەهێناو هەردووکیان تا دەمەوبەیانی دادەنیشتن و قسەیان دەکرد. ڕێزان تەلەفۆنی بۆ ئاڤێستا کرد کە کۆتایی هەفتە بێت بۆ لای. لە دەنگی ئاڤێستا هەستی بە خەمێکی گەورەکرد. ئەوە بۆ ڕێزان چاوەڕوان

نەکراو بوو. ئاڤێستا بەردەوام پێدەکەنی و هێمنییەکی قوڵ لە چاوەکانیدا دەبینرا. کەچی ئەو ساتە لەدەنگییدا هەستی بەبارگرانییەکی زۆر کرد.

ڕێزان لەو باوەڕەدابوو ئاڤێستا هەرگیز سەختی و ناخۆشی لە ژیاندا نەبینییوە. بۆیە بەردەوام دەم بەپێکەنینەو لەماوەیەکی کورتدا توانییوەتی وا فێری زمانی سوێدی ببێ و کارێکی وا باش بکات. وەک هەموو جارێ خواردنی ئامادەکرد. ئاڤێستا لەگەڵ منداڵەکانی ڕێزاندا دەبووەوە منداڵێکی دە ساڵان و هەموو جۆرە یارییەکی لەگەڵیاندا دەکرد. لە چاوشارکێوە تا هۆ ڕێوی ڕێوی. دەبووە سەگ و بەدوایاندا ڕایدەکرد و ئەو دەبووە مشک و ئەوانیش دەبوونە پشیلەو ڕاویان دەکرد. منداڵەکان ماندوو دەبوون، دەچوونە ژوورەکەی خۆیان و دەخەوتن. ڕێزانیش لە دوورەوە سەیری دەکردن و پێدەکەنی. دڵی بە منداڵەکانی دەسووتاو لەلایەکی ترەوە ویژدانی ئازاری دەدا، ئەو وەک دایکێ، ئەو کاتەی لەگەڵ منداڵەکانیدا نییە، فریا ناکەوێت بەو شێوەیە یارییان لەگەڵدا بکات. ئەو هەموو ڕۆژێ پاش کار هەر ئەوەندە فریا دەکەوێت خواردنیان بۆ ئامادەبکات و لە خوێندنەکەیاندا یارمەتیان بدات. دوای ئەوە هێندە ماندوو دەبێت توانای پێکەنین و یاریکردنی نامێنێت. ئەمەش گرفتی دایکە تەنیاکانی ئەم وڵاتانەن. کارو پەروەردەی منداڵەکانیان هەموو کاتیان داگیردەکات و ئاگایان لە خۆیان نامێنێ. کاتێ منداڵەکانیان گەورە دەبن و دەڕۆن هەستی تەنیایی دەیان توێنێتەوە. پیاوەکانیش هەر پاش جیابوونەوە ژن دەهێننەوە و منداڵی تر دروست دەکەن. نازانم ئەمەی ئێرە باشترە یان ئەوەی کوردستان، لەوێ منداڵەکان لای باوک دەمێننەوە. باوک ژنێکی دی دەهێنێ و باوەژن دێتە سەر ماڵ. باوەژنیش خۆی و خوای خۆی. لەوێ منداڵ دەبێتە قوربانی یەکەمی جیابوونەوە، لێرەش ژن دەبێتە قوربانی یەکەمی جیابوونەوە. ژنی تەنیا

هەرکاتێکیش بیەوێ کەسێکی کە بهێنتە ژیانییەوە بە پلەی یەکەم بیر لەمنداڵەکان دەکاتەوە. ڕێزان ئاڤێستای بانگ کردو وتی:»دەزانی دڵم خەریکە دەتەقێ. وەرە بۆت باسبکەم ، ئەوە ماوەیەکە بیر لە خۆمانی ژن دەکەمەوە. لە هەموو کاتەکان و لە هەموو وڵاتەکاندا مافخوراوین. تەماشا کە سروشتیش دژی ئێمە کاردەکات، ئێمە هەڵەمان کردو سێوەکەمان خوارد، تا ئێستاش سزای ئەو هەڵەیە دەدرێن. ئێمە سوڕی مانگانەمان بۆ دێت، دەبێت ئەو ئازارە هەموو مانگێ بچێژین. ئێمە نۆ مانگ منداڵ بە چەرمی سک هەڵدەگرین پاش ژانێکی زۆر مرۆڤێ دەهێنینە ئەم ژیانەوە، پاش ژانی هەر منداڵێک تۆبە لە منداڵبوون دەکەین. کەچی درۆ دەکەین، منداڵ لە دوای منداڵ دروستی دەکەین. ئێمە لە تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵیدا هێلکەدانمان وشک دەکات و توانای منداڵبوونمان نییە، کەچی پیاوەکان تا تەمەنی هەفتا ساڵێش سپێرمەکانیان بەکارە. ئەوان بەردەوام ژنێک دەهێنن بیست ساڵ لەخۆیان منداڵترە، ئێمەین بە دیار منداڵەوە دادەنیشین نەک پیاوەکان، ئێمەین واز لە خۆمان و کارەکانمان دەهێنین بۆ ئەوەی منداڵەکانمان گەورە بکەین. هەندێ جار بیر لە سروشت دەکەمەوە هیچ هاوسەنگییەکی تێدا نابینم، تۆ دەڵێی چی؟ من بەردەوام بیر لە نادادپەروەری ژیان دەکەمەوە. بەرامبەر بە ژن، بەتایبەتی. تەماشا کە، لەبەرئەوەی ئێمە هێندە لە سروشتەوە نزیک بووین توانیوومانە لە سروشت بگەین و لەگەڵی تێکەڵ بین، و هێزەکانی سروشت بۆ خزمەتی ژیان بەکاربهێنین، کەچی ناویان لێناین سیحرباز و لەناو ئاگردا سووتاین. کە ویستمان وشە بخەینە کار و هەستەکانمان دەرببڕێن، مافی دەربڕینی وشەیان پێنەدەداین، دەبوایە ناوی پیاوانەمان بۆ خۆمان هەڵبژاردایە. دەبوو جلی پیاوانەمان لەبەربکردایە بۆ ئەوەی بەرگریی لەو خاکە بکەین کە زێدەمان بوو. مافی ئەوەمان نەبوو کەسێکمان خۆشبویستایە ئەگینا بەردباران دەکراین.

تەماشاکە قورسایی ژیان بەسەرشانی ئێمەوەیە کەچی نە دەنگمان دەبیستریٚ نەهەستەکانمان دەبینریٚ، هەروەک ئەوەی تاشەبەردی قەدپاڵی چیایەک بین. لەهەموو بارێکدا هەر ئێمە قوربانین. لەکاتی شەڕدا دەبینە باوک و دایک بۆ منداڵەکانمان، دەبینە جەنگاوەر و شەرەفی نەتەوەمان هەڵدەگرین، بۆیە کە دوژمن پیٚ دەنێتە سەر خاکی هەر وڵاتیٚ، یەکەمین شت بیری لێدەکاتەوە زەوتکردنی شەرەفی ژنەکانە. ئەمە تازە نییە بەڵکو لەو کاتەوەی شەڕ و داگیرکردن دەستی پێکردووە، ئەمە هەبووە. پێش ماوەیەک ڕۆمانێکی ئیزابێل ئەلیندیم خوێندەوە کە ناوی ئینێس، ڕۆحە خۆشەویستەکەم. کاتیٚ لە سەدەی شانزەوە ئیسپانیا وڵاتانی ئەمریکای لاتینی لە هیندییە سوورەکان داگیردەکرد، یەکەمین شت بیرییان لە ژن و منداڵەکانیان دەکردەوە. ئەو ڕۆمانە ڕایوەشاندم و بیرم لە ژنێتی خۆمان کردەوە. ئێمەین قوربانی یەکەمی شەڕ و ئاشتی. کە شەڕە، دەستدرێژیمان دەکرێتە سەر، پاشان دەبینە بێوەژن و هەتیو بەخێودەکەین. لەکاتی ئاشتیشدا کەس نامانبینیٚ و پیاوان لەسەر شانی ئێمەوە سەردەکەونە سەر کورسی دەستەڵات. مەگەر هەموو ژنەکانمان وەک ئینێسی سوارچاکی ئەو ڕۆمانە بن، تا بتوانین ڕووبەڕووی سروشتیش بینەوە. هەندیٚ جار دەپرسم لە خودا، لە گەردوون لە سروشت بۆ ئێمەیان بەم شێوەیە دروستکردووە یان بۆ ئەم جیاوازی و نادادپەروەرییە لە نێوان ئێمە و پیاواندا هەیە. ئەی خودایە ئەم ناحەقییە چییە. دەقسەیەک بکە، تۆیەکی دەم بە پێکەنین چۆن سەیری ئەم نادادپەروەرییە دەکەیت.».

ئەو دوو فرمێسکە قەتیس ماوەی چاوانی ئاڤێستا بەسەر گۆناکانیدا هاتنە خوارەوە و سەری خستە سەر شانی ڕێزان و هێندە بە کوڵ دەگریا، وا هەستت دەکرد بورکانێکی قەتیس ماوەی ناو قوڵایی زەمین تەقیوەتەوەو

هەرچی گەرمی ناو زەمینە لەگەڵ خۆیدا هێناوەتە سەر رووی زەوی. «ڕاستە من قسە ناکەم، ئەو داخانە لەدڵی مندایەو برینەکانت کولاندمەوە. لەو کاتەوەی هاتمە ئێرە بڕیارم دا ڕابردوو لەبیربکەم و لە ئێستا و لێرەدا بژیم. زۆر هەوڵم دا. ڕاستە تا ڕادەیەک سەرکەوتووبووم، بەڵام کە دەچمە ناو خۆمەوە بۆم دەردەکەوێت برینەکانم هێشتا خوێنیان لێدەتکێ. چوومە لای زۆر پزیشکی دەروونی زۆر میتۆدی چارەسەرم تاقیکردەوە. بەڵام هێشتا شوێنی ئەو برینانە دەبینم و هەستیان پێدەکەم. کاتێ بەر شەقی دام و سەرم بەر دیوارەکە کەوت، لەهۆشی خۆم چووم و مردنم بە چاوەکانی خۆم بینی. بۆ چەند ساتی جەستەی خۆمم جێ هێشت و لە باوەشی لێشاوێکی ڕووناکیدا خۆمم بینییەوە، هەر خۆی بەهۆشی هێنامەوەو لە باوەشی ئەو ڕووناکییەی دەرهێنام و هاتمەوە ناو جەستەم. زۆرجار دەڵێم خۆزگە ئەو کارەی نەکردایە، من بڕۆیشتمایە باشتربوو. کە لەوێ بووم لەو هەستەی خۆم و لەو ڕووناکییە نەدەگەیشتم کە بینیم. ئێستا پاش خوێندنەوەی ئەو کتێبانە زانیم ئەو ساتە پێی دەڵێن ژیان لەناو ساتەکانی پێش مردندا. زۆر کەس لەناو ئەو ساتانەدا دەژیێتن و لە ماناکەی ناگەن. ئەو ساتانە ساتی پێش مردنە. من پاش ژیان لەو ساتانەدا هەرگیز لە مردن ناترسم. مرۆڤ بەرەو ڕووناکییەکی زۆر ڕۆشن دەڕوات، بەڵام بەداخەوە کە کاتت تەواو نەبێت دێیتەوە بۆ ناو ژیانی پڕ چەرمەسەریی سەرئەم زەمینە. ئەم ژیانەی ئێمە تێیدا دەبینە قوربانی دەستەڵات و ئارەزووەکانی پیاو. من تا ئێستا بۆم باس نەکردبووی چی منی گەیاندە ئەم وڵاتە. من لە شوێنێکدا لای پیاوێکی دەستەڵاتدار کارم دەکرد. لە تەمەندا زۆر لەمن گەورەتربوو، کچەکانی تەمەنیان لەمن زیاتر بوو. هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم ئەو بەو شێوەیە بیر لە من بکاتەوە. بە قسەو کردەوەکانی سەرنجی منی ڕاکێشا، کەس وەک ئەو وەسفی جوانی منی نەدەکرد.

هەندێ جار هۆنراوەی شاعیرەکانی بۆ دەهێنام و لەسەر مێزەکەمی دادەنا. هەندێ جار دیاری گرانبەهای بۆ دەکڕیم و لە چەکمەجەی مێزەکەمدا بەجێیدەهێشت. گەیشتمە ئەو باوەڕەی خۆشی دەوێم. وام لێهات بیرم لە تەمەن نەدەکردەوە، بیرم لەوە نەدەکردەوە ئەو خاوەنی ژن و کۆمەڵی منداڵ و دەستەڵاتە. ئەو پێش من دەڕۆیشتەوە، من پاش سەعاتێ لە ڕۆیشتنی ئەو بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتمەوە.

ڕۆژێکیان بانگی کردمە لای خۆی و وتی خانوویەکم کڕیوەو دەمەوێ لەگەڵمدا بێیت سەیری بکەین، دەمەوێ هەندێ گۆڕانکاری تێدا بکەم. دەزانم تۆ زەوقت زۆرجوانە. منیش بێ بیرکردنەوە ڕازی بووم. لەنیوەی ڕێگا شۆفێرەکەی دابەزی و خۆی ئۆتۆمۆبیلەکەی لێخوڕی. شۆفێرەکە بە نیگایەکی پڕ ماناوە سەیری کردم. ئەو کات بەبزەیەکەوە تەماشام کردو بێدەنگ بووم. پاشان تێگەیشتم مانای نیگاکەی چی بوو. چوینە ژوورەوە، ماڵێکی تا بڵێی گەورەو خۆش بوو، جوانترین مۆبیلیای لێبوو. سەرم سوڕما و سەیرێکم کرد و پێش ئەوەی پرسیارەکە بکەم. باوەشی پێدا کردم و وتی ئەم ماڵە هی من و تۆیە. لێرە دەتوانین یەکتر ببینین. خۆت دەزانی من چەندم خۆشدەوێت. هەموو بەیانییەک خەبەرم دەبێتەوە دڵم خۆشدەبێت لەبەرئەوەی دێمە سەرکارو تۆ دەبینم. بوونی تۆ ژیانی لاخۆشکردووم و هەموو ڕۆژێ کە خۆم دەگۆڕم هەست دەکەم کوڕێکی بیستساڵانم، چونکە دەزانم لە سەرکار جوانێکی وەکو تۆ قەدوباڵام دەبینێ. جوانەکەم گەر بشتەوێ هەندێ جار دەتوانی بێیتە ئێرە. سبەی ئۆتۆمۆبیلێکت بۆ دەکڕم، جامەکانی ڕەش بێت بۆ ئەوەی کە دێیتە ئێرە کەس نەتبینی. چاکەتەکەی داکەندو فڕیی دایە سەر یەکێ لە قەنەفەکان و منی ڕاکێشایە باوەشییەوە، دەمی خستە ناو دەممەوەو سمێڵەکەی هێندە زبر بوو هەستم دەکرد دەرزی دەکات بە دەممدا.

هەوڵم دا خۆم له ئامێزی دەرکەم، کەچی وتی «شەرم مەکە ئاسکەکەم، من و تۆ هەربۆ یەک خوڵقاوین، هەرچەند تەماشای ناوقەدت دەکەم خەریکە دەتوێمەوە. لەباوەشی گرتم و بردمییە ژووری نووستنەکەوەو لەسەر جێگەکە دایناﻡ. کەوت بەسەرمدا، وا هەستمکرد بەرمیلێ کەوت بەسەرمدا. ئەمجارەش ویستم خۆم لەژێری دەرکەم. جارێکی تر وتی «وامەزانە من له تۆ گەورەترم و توانای ئەم شتانەم نەماوە. بەقەد دە کوڕی گەنج هێزو جۆشم تێدایە. ئەمجارە پارچە بە پارچەی جلەکانی داکەندم و سەرتاپای گیانی ماچ کردم. هێندە بە هێز گۆیی مەمکی مژی تا ئێستاش کە بیری لێدەکەمەوە هەست بە ئازار دەکەم. ئیتر شوێن نەما لەگیانمدا ماچی نەکات و نەیمژێ. هەر دەمویست خۆم ڕابسکێنم لەدەستی، دەیگرتمەوەو دەیوت»دەمزانی هەموو گیانت سەرچاوەی لەزەت و خۆشییە، من لە ژێر جلەکانیشتەوە هەموو جەستەتم دەبینی. من هەموو جوڵانەوەیەکی بەنازی تۆم دەبینی. تۆ شەراب و ویسکی منی. نازانم چۆن منیش پاش ماوەیەک لەبەردەستیدا بوومە پارچە ئاوریشمێک و هەوڵمدا خۆشی لەهەموو ئەو شتانە ببینم کە لەگەڵی دەکردم و نەمزانی چۆن تێکەڵی بووم.

من ئێستا بیردەکەمەوە چۆن وا بە ئاسانی خۆمم دا بەدەستەوە. لەوانەبێ لەبەرئەوەی لەو باوەڕەدابووم ئەو منی خۆش دەوێت. منیش ئەو هەستەم لەدڵدا دروست ببوو، من هەتا ئەو کاتە کەسێک نەبوو بەو شێوەیە ئاوا بایەخم پێبدات. ئەو وای کرد من هەست بەجوانی و گرنگی خۆم بکەم. ئەو کات تەمەنم تەنیا بیست و چوار ساڵ بوو. هیچ ئەزموونێکم نە لەبواری سێکس و نە لەبواری خۆشەویستیدا نەبوو. لەگەڵ ئەوەی کۆلێژم تەواوکربوو، بەڵام بەردەوام خۆمم لە کوڕ دووردەخستەوە. تەنیا لەگەڵ کچەکانی کۆلێژدا پەیوەندیم هەبوو. بۆیە ئەو یەکەمین کەس بوو بەو شێوەیە دڵی ڕاکێشام. ئەو شەوە

تا درەنگانێ پێکەوە بووین. ئەو هەستی کرد من لەو بواری سێکسدا هیچ شارەزاییم نییەو ئەویش یەکەم کەس بوو من لەگەڵییدا بخەوم. نازانم بۆ هێندەی تر منی لا شیرین بوو کە زانی لەگەڵ کەسی تردا نەخەوتووم. هەوەس و ئارەزووەکانی وەک لووتکە بەرزبوویەوە. من ئەو شەوە زۆر شت لەژیان گەیشتم. من بە دڵەوە لەگەڵ ئەو بووم.

لە سەرەتاوە زوو زوو دەچووین بۆ ئەو خانووە تا ئێوارەیەکی درەنگ لەوێ دەماینەوە. هەندێ جاریش داوای لێدەکردم پێش وەخت بچم و خواردنی بۆ ئامادەبکەم. ئەمانە زیاتر و زیاتر منی بەوەوە بەستەوەو بڕوام بە هەموو قسەو بەڵێنەکانی دەکرد. شەش مانگێ وا بەردەوام بووین. بەلایەنی کەمەوە لە هەفتەیەکدا دوو تا سێ جار ئێواران پێکەوە دەبووین. پاشان لەناکاوا کەمترو کەمتر دەبوویەوە. ئەو کەمبوونەوەیە منی دەخستە گێژاوەوە. لەهەمووی سەیرتر ئەوەبوو وەک جاران تەماشای نەدەکردم، دیاری بۆ نەدەکڕیم، بە بەژنوباڵامدا هەڵینەدەدا. بە داخەوە من هیچ مەرجێکم نەبوو بۆ ئەم پەیوەندییە، خوم پێوە گرتبوو. ئەو ڕۆژەی گوێی نەدایە پێم هەموو گیانم هاواری لێهەڵدەستا. نەشمدەوێرا خۆم لێی بپرسم بۆچ وەک جاران پێکەوە نابین. دەترسام زۆر قاچم درێژبکەم لە کارەکەش دەرم بکات. ئەم بەزمە چەند مانگێک درێژەی خایاند. پاشان دەرکەوت سکم هەیە. ئێوارەیەک داوام لێی کرد کە بیبینم. ڕازی بوو. چووینە ئەوێ، بۆم باس کرد سکم هەیە. سەیرێکی کردم وتی لەم هەفتەیەدا دەبێت کورتاج بکەی. دەتنێرمە لای دکتۆرێکی ناسیاوی خۆم. دەستم کرد بەگریان وتم ئەی تۆ بەڵێنت نەدا بمهێنی. بە تووڕەییەوە وەڵامی دامەوەو وتی «من چۆن کاری وادەکەم. ژنەکەم گەر بەمە بزانێ خوا دەزانێ چیدەکات. خۆت دەزانی ئەو کچی کێیە. ئەوەشی هەمە لەدەستم دەروات». ئەو ئێوارەیە توخنم

نەکەوت. ماوەیەک بەبێ دەنگی دانیشت. منیش لە جێگەی خۆم نەجولام. پاشان بەبێدەنگی هەردووکمان ڕۆیشتین. بۆ ڕۆژی داویی بانگی کردمە ژوورەکەی خۆی. ویستی بزانێ کەس بەم پەیوەندییەی ئێمە دەزانێ. من باسی ئەو پەیوەندییەی خۆمم بۆ دایکم کردبوو، ئەو نەیدەزانی سکم هەیە.

تا ئێستاش نەمزانی چۆن دایکم بێدەنگ بوو لەو پەیوەندییەم. لەوانەیە لەو بڕوایەدا بوبێت هەر دەمهێنێ. براکەشم لەخۆم بچووکتربوو، هەرگیز پرسیاری ئەوەی نەدەکرد من لە کوێم و بۆ کوێ دەچم. دایکم ترسی ئەوەی هەبوو گەر ئەو پەیوەندییە ببچڕم ئەوا لەوانەیە کارەکەم لەدەست بدەم. ژیانیشمان بەبێ ئەو کارەی من نەدەڕۆشت بەڕێووە بۆیە وا بێدەنگ بوو. بەڵام هەرگیز نەموێرا مەسەلەی سکپڕبوونەکە بە دایکم بڵێم. چەند ڕۆژێ تێپەری ئەو هەر بێدەنگ بوو، تەنانەت کە دەهات سەیری نەدەکردم، ئەمە ئەوەندی تر ئازاری دەدام. کەوتمە گێژاوەوە نەمدەزانی هانا بۆ کێ بەرم. هەندێ جار دەهات بەسەرمدا شتێ لە خۆم بکەم، پاشان بەزەیم بە دایکم وبراکەمدا دەهاتەوە. گەر من شتێکم لێبهاتایە، شەهیدانەکەی باوکم بە هیچ جۆرێ بەشی نەدەکردن».«ئێ هەرباشبوو وەک هەندێکی تر نەیکوشتووی و فڕیی نەداویتە ناو ڕووبارێکەوە». «نەیدەتوانی ئەو کارە بکات هەرهیچ نەبێت دوو کەس ئاگاداری ئەو پەیوەندییەی ئێمە بوون. ئەوەی لە پیاوەتی خۆی نەکرد، لەلایەکی ترەوە ترسی ئەوەی هەبوو من ئەو پەیوەندییە ئاشکرا بکەم. هەرچەندە دەشیزانی من کچێکی بێ ئەزموون و نە شارەزام. ڕۆژێک منی لەگەڵ ڕۆژنامەنووسێکی ژندا بینی. منیش بە دەستی ئەنقەست دەستم بۆ سکم برد و سەیرێکی ئەوم کرد، هەر پاش ئەوەبوو داوای وێنەی خۆمی کرد وتی پەساپۆرتت بۆ دەردەکەم بچۆ دەرەوەو هەر

گەیشتی دەبێت منداڵەکە دەربهێنی. منیش هێزم دایە بەرخۆم وتم چۆن کچێکی گەنجی وەک من بەرەڵای دەرەوە دەکەی، من نەچوومەتە شارەکانی تری کوردستان. ئەی چی بە دایکم و کەسوکارم بڵێم. گەر وایە با براکەشم بێت لەگەڵمدا، هەروا دەمەوێ موچەکەم جارێ بەردەوام بێت و دایکم وەری بگرێ. شەهیدانەکە بەشی دایکم ناکات. هاتمە ئێرە خێرا منداڵەکەم لەباری خۆم برد. ئەوە مەرجی ئەوبوو، بۆ ئەوەی هەردووکمان بنێرێتە دەرەوە. هەتا ئێستا نە براکەم نە دایکم بەمەیان نەزانیووە. بۆیە کە لێم دەپرسی بۆ شوو ناکەم و بۆ پیاوێک لە ژیانمدا نییە ئەوە هۆکەیەتی. لە تۆ زیاتریش پەیوەندیم لەگەڵ هیچ کوردێکدا نییە. لەوەشدا حەقمە. مەگەر بۆ پرسەی دایکم بڕۆمەوە. جارێکی تر سەر ناکەمەوە بەو وڵاتەدا. لەبەر دایکمە کەوا بێدەنگم، گەر دایکم بمرێ ئەوا بە نیازم لە ئینتەرنێت حەیای ببەم، هەموو شتەکان بە وردی باس دەکەم. دەبێت حەقی خۆمی لێبکەمەوە.»

گەر ئێوەش دەتانەوێ چیرۆکی زیاتری لەو بابەتە بخوێننەوە، ئەوا کتێبی ئۆڤیانووسێک لە تاوانی خەندان بخوێننەوە. نازانم ئاڤێستا یەکێکە لەوانەی خەندان خان گفتوگۆی لەگەڵ کردووە، یان ئەمیش یەکێکە لەو هەزاران کچەی کەوتنە بەر شاڵاوی دەستدرێژی و سوکایەتی پیاوانی دەستەڵاتدارو خاوەن پارە.

فرمێسکەکانی ئاڤێستا نەدەوەستان و بەدەم هەنسکدانەوە وشەکان لەگەڵ ژاندا دەهاتنە دەروەوە. «زۆر جار بیر لەوە دەکەمەوە ئاخۆ پێش من و پاش من چەند کچێکی تر یان چەند ژنێکی تر ئەو ماڵە بووە بە مێردەزمەی ژیانیان. ئێستا پاش ئەوەی ئەو هەموو ساڵە بەسەرچوو، هۆشم دەگەڕێنمەوە ئەو ڕۆژانەی لەو خانووەدا بەسەرم

بردووه، به هەموو ئەو وردەكارییانەدا دەچمەوە. زۆر شت دەبینم، ئەو كاتە نەمدەبینی یان نەمدەویست ببینم. ئێستا دەزانم من یەكەم كەس نەبووم چوومەتە ئەو خانووە. جارێك لە یەكێ لە ژوورەكان چەند دەرپێیەكی ژنانەم بینی، لە ژێر یەكێ لە قەروێڵەكان فڕێ درابوون. وابزانم نەمویست بیرلەوە بكەمەوە ئەمە هی كێیە، كێ هاتووەتە ئێرە. بەقسەی ئەو بووایە لە من زیاتر كەسی كە، نەدەچووە ئەو ماڵە. لە سەرەتاوە باسی ئەوەشی كرد دەیەوێ ئەو خانووە لەسەر من تاپۆ بكات. بۆ دایكمم گێڕایەوە بڕوای كرد و زۆر دڵی خۆشبوو. بەڵام من لە دڵەوە ئەوەم نەدەویست. چونكە ئەو هەموو ماوەیەی پێكەوە بووین، كەسمان بیرمان لە پێكەوەنانی ژیانی هاوسەرێتی نەدەكردەوە. منیش بەوە ڕازی بووم. تا كات زیاتر تێپەڕدەبوو زیاترو زیاتر هەستم دەكرد دەبمە كۆیلە. ئامادەی هەموو شتێ بووم تەنیا بۆ ئەوەی هیمایەكم بداتێ و ئەو ئێوارەیە بەرەو خانووەكە بڕۆم. لەسەرەتاوە پێی وتم هەركات دەتەوێ دەتوانێ بڕۆی بۆ ئەوێ، پاش ماوەیەك وتی تا من پێت نەڵێم مەچۆ ئەو خانووە. منیش هەرگیز ئەو پرسیارەم لێنەدەكرد. ئەو دوو بۆشایی بۆ من پڕدەكردەوە، یەكەمیان پێداویستی سێكسیی بۆ پڕدەكردمەوە. لە ڕووی مادیشەوە بەردەوام پارەی دەدامێ. ئەو بۆمن بووە مادەی بێهۆشكەر، كاتی بهاتایەو نەچوومایەتە لای. وەك نیمچە شێتم لێدەهات. كەس نەیدەتوانی قسەم لەگەڵ بكات و خواردنم پێنەدەخورا. بەردەوام تووڕەبووم، حەبم دەخوارد بۆ ئەوەی شەوان خەوم لێبكەوێ. لەو دوو مانگەی دواییدا فێری خواردنەوەشی كردم. خواردنەوەكە نەشئەیەكی تایبەتی پێدەبەخشیم. ئەوەبوو لەو ماوەیەدا بیری خواردنی حەبەكانی مەنعم نەبوو. هەر خۆی لەسەرەتاوە ئەو حەبانەی داپێم. لەبیرمە وتی تا باری خۆمان یەكلادەكەینەوە دەبێت ئەم حەبانە بخۆی و نابێت بیرت بچێ. دەتوانی حەبەكان هەر لەناو

چەکمەجەکەتدا دایبنێ. باماڵەوەتان ئەو حەبانە نەبینن. خۆ دایکم نەخوێندەواربوو، براکەشم لە دنیای خۆیدابوو. حەبەکانم لە کاتی خۆیدا نەخوارد، هەربۆیە سکیشم پڕبوو.
کە سکم بوو هەستمکرد شتێک لەناو خۆمدا گۆڕا. ترسێ لە دڵمدا دروستبوو، ترسی ئەوەی بەجێم بهێڵێ. ئەو کات من هیچ دەستەڵاتێکم نەبوو، نەمدەتوانی هیچ بکەم. هەندێ جار دەمووت لەوانەیە شتێکم لێبکات، لە دڵیشەوە حەزم دەکرد لەناوم ببات لەوانەیە ئەوە باشترین چارەسەربوو بێت بۆ من. ڕاستیت دەوێ لە سەرەتاوە من چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد بەم شێوەیە گرفتەکە چارەسەربکات. نازانم چۆن ئەو سەفەرەی وا بەخێرایی بۆ ڕێکخستین. ئەو کەسەشی یارمەتی داین کێسێکی باشی بۆ ڕێکخستین. ئەوەبوو پاش دوو مانگ هەردووکمان ئیقامەمان وەرگرت. پاش ئەوەی گەیشتنە ئێرە بە هەفتەیەک منداڵەکەیان بۆ دەرهێنام. ماوەیەکی زۆری برد تا هاتمەوە سەرخۆم. ڕۆژێک لەسەر کورسی باخچەیەک دانیشتبووم و ئاگام لەخۆم نەمابوو. فرمێسکەکانم بەخوڕ دەهاتنە خوارەوە، پیاوێک تەمەنی سەرووی شەست ساڵەوە بوو، هاتە تەنیشتمەوە دانیشت پرسی»سوێدی دەزانی»»نا بەڵام ئینگلیزی دەزانم». «دەمەوێ یارمەتیت بدەم. ئەو فرمێسکانە وا بەئاسانی نایەنە خوارەوە، کۆمەڵێ ئازار لە پشت ئەو فرمێسکانەوەن. دەبێت خۆت لەو ئازارانە ڕزگاربکەیت، ئەو ئازارانە جێگەی خۆیان لە ژێر هۆشتەوە کردووەتەوە، دەبێت خۆت لەو ئازارانە ڕزگاربکەیت تابتوانیت ژیانێکی ئاسایی بژیت.».

ئەو پیاوە سەرسپیە چاوشینە وەک فریشتەیەک وابوو بۆ من. منی گەیاندە گرووپێک بە میتودی داینێتیک توانییان هەموو ئەو ڕووداوانەی لە ژیانمدا برینیان دروستکردبوو، هێندە کاریان لەسەرم نەمێنێ.

گرفتەکە ئەوەبوو من ئینگلیزییەکەم هێندە باش نەبوو، بۆیە نەمدەتوانی وا بەئاسانی هەموو ئەو شتانەی دەمویست باسی بکەم. هەروا زۆر شت کە پەیوەندی بەو پیاوەوە هەبوو ڕووم نەدەهات بۆ پیاوێکی تری باسی بکەم. پاش دوو مانگ هەستم کرد ژیانم گۆڕا و هەستم بەبارسووکی دەکرد و ژیان و ڕەنگەکانم بەشێوەیەکی تر دەبینی و خۆشیم لەهەموو شتێ دەبینی. هەموو ئەو شتانەی دەمویست بە ئاسانی بەدەستمەوە دەهاتن. زۆر جار دەتووت خۆزگەم بەخۆت وا دڵت خۆشە، ئێستا دەزانی لە تۆ خراپترم بەسەرهاتووە. لەو باوەڕەدام گرنگ ئەوەیە ڕێگایەک بدۆزیتەوە خۆت لە ئازارەکان ئازادبکەیت، بۆ ئەوەی کار لە ڕەوت و خۆشی ژیانت نەکات. وابزانم هەموومان پێویستیمان بە چارەسەری لەو بابەتە هەیە. تاقە شتیک تا ئێستا نەمتوانیووە بیگۆڕم لە خۆمدا، ڕقێکی گەورە لە دڵمدایە بەرامبەر ئەو پیاوەی ژیانی گەنجێتی و بەختەوەری لێ زەوت کردم ، تا ئێستا نەمتوانییوە سەیری پیاوێک بکەم. هەر کە دەموچاوی پیاوێک دەبینم خێرا دەموچاوی ئەوم دێتە پێش چاو. تا ئێستا چەند کەسێک هاتوونەتە سەر ڕێگام و نەمتوانییوە بیانهێنمە ژیانمەوە. دڵم زویربووە لە پیاو. پیاوەکان هەموو وەک یەک دەموچاو و یەک مەبەست دەیانبینم».

هەموو ناسیاوەکانی ئاڤێستا ژنن، بە هەموو شێوەیەک خۆی لە پەیوەندی لەگەڵ پیاودا لادەدات. ئاخۆ گەر هەر یەکە لە ئێمە هەمان ئەزموونی ئەومان هەبێت چۆن مامەڵە لەگەل ژیاندا دەکەین. هەر یەک لە ئێمە بە ئەزموونی جۆراو جۆر تێپەڕیوون و هەر یەکەیان بە شێوەیەک کار لە ڕەوتی ژیانمان دەکەن، بەبێ ئەوەی ئێمە هەست بە کاری ڕاستەوخۆی ئەو ڕووداوانە بکەین. ئێمەی ڕۆژهەڵاتیی بەردەوام بە بەرد سەری برین و ئازارەکانمان دادەپۆشین، تا وای لیدێت لە

بارگرانیدا ناتوانین هەنگاو بۆ پێشەوە بنێن. بەو شێوەیە کار لە ژیانی خۆمان و دەوروبەرمان دەکەین. ئاڤێستا دەرگای بە ڕووی پیاواندا داخستووە، بەڵام زۆر دەرگای تری کردووەتەوە. لەماوەی یەک ساڵدا فێری سویدییەکی باشبوو. پاشان ئەوەی پێویست بوو بۆ خوێندنەکەی لە زانکۆ تەواوی کرد و خێراش کاری دەستکەوت. ئەوەی یارمەتی ئاڤێستای دا ئەوەبوو بە ڕێکەوت پیاوێکی ناسی. ئەو پیاوە جیهانێکی پڕ ڕەنگ و ڕووناکی بە ڕوویدا کردەوە.

- 4 -

هەتاو داوای لە ئۆلگا کرد دەریا بدۆزێتەوەو بزانێ لە کوێیە و ژیانی چۆن بەڕێوە دەچێت. ئەو ساڵانە هەتاو بەردەوام بیری لە دەریا و ڕێزان دەکردەوە. ئەو دەیزانی دایک و باوکی شارا وەک بەرزەکی بانان لەو تاوانە دەربازیان بووە. دەریا ژیانی لە باوکی و ژنەکەی تێکدا و پاشان بردیانەوە لای دایەگەورەو بابەگەورە. لەوێش زۆر کاری سەیروسەمەرەی کرد تا وای لێهات ئەوان نەیانویست دەریا لای خۆیان بهێڵنەوە. بۆیە دەریا درا بەماڵێکی سویدی. دەریا لەسەرەتاوە زۆر بەزیرەکی هەڵسوکەوتی کرد. دەستی کرد بە قوتابخانە، لە قوتابخانەدا زۆر زیرەک بوو. زۆر بەئاسانی فێری خوێندنەوە بوو. ئۆلگا وتی دەریا لای ماڵێکی سویدییەو زۆر بۆی باشن، بەڵام لای

ئەوانیش نامێنێتەوە لەبەرئەوەی ژنی ئەو ماڵە بە نەخۆشییەک دەمرێ. پاشان دەریا دەبرێتە لای ژنێکی کورد، کە لە وڵاتەکەی ئێوەوە هاتووە. ئەوکات ژیانی دەریا دەچێتە قۆناغێکی ترەوە.

ئۆلگا ڕاستی کرد. پاش ماوەیەکی کورت دەریا کەوتە لای ئاڤێستا. ئاڤێستا نیازی نەبوو شووبکات، بۆیە بڕیاری دا کچێکی کورد هەڵگرێتەوە. ماوەیەک بوو پەیوەندی بەلایەنە لێپرسراوەکانەوە کرد بۆ ئەم مەبەستە. پاش چەند مانگێ پەیوەندییان پێوە کرد و پێیان وت کچێکی کورد هەیە، گەر بیەوێ. چووە لای لایەنە لێپرسراوەکان و داوای بینی ئەو منداڵەی کرد کە دەیەوێ هەڵیگرێتەوە . هەستی بە دڵخۆشی دەکرد، نەشیدەزانی بۆ. پاش ماوەیەک دەریا هاتە ژوورەوە، هەردووکیان بەبینینی یەک گەشانەوە. دەریا تەمەنی هەشت ساڵان بوو، قژە ڕەشە خاوەکەی کرابووە دوو پرچ، لە چاوە ڕەشە گەشەکانیدا خەمێکی قوڵی تێدا بەدی دەکرا. لەگەڵ ئەوەش تروسکەی خۆشیت لە چاوانیدا بەدی دەکرد. لێپرسراوەکان بەم سەرەتایەی نێوان ئاڤێستاو دەریا زۆر دڵخۆشبوون. ئاڤێستا خۆی بەدەریا ناساندو هەندێ باسی خۆیی بۆکرد. دەریا بە کوردی پێی وت «درێژەی مەدەرێ زووکە با بڕۆین، دوایی قسەدەکەین». ئاڤێستا بەم قسانەی دەریا سەری سوڕما، شێوەی قسەکردنەکەی وەک کەسێکی گەورەبوو نەک منداڵێک. هەر لەو ساتەدا ویستی پەشیمان بێتەوە و ترسی لێنیشت کە ئەمە منداڵێکی شێت بێت و دوایی گیربخوات بەدەستییەوە. بەڵام دەنگێ لە دڵییەوە هێمنی کردووە و داوای لێی کرد پەلەنەکات. داوایان لە دەریا کرد بۆ ماوەیەک بچێتە دەرەوە تا هەندێ قسە لەگەڵ ئاڤێستا بکەن. دەریا هەستاو چووە دەرەوە، پێش ئەوەی بچێتە دەرەوە لایەکی بۆ کردەوەو وتی «بڕوا بە هەموو قسەکانیان مەکە، من دوایی خۆم

هەموویت بۆ باس دەکەم، تکایە پەشیمان مەبەرەوە لەوەی من بکەیت بە کچی خۆت.»ئەم قسەیەشی نیگەرانییەکی زۆری لا دروستکرد. ژنە لێپرسراوەکە هەندێ زانیاری لەسەر دەریا و قوتابخانەکە و پێداویستییەکانی باس کرد و ئەوان دەیانویست بە هەموو شێوەیەک ئاڤێستا ڕازی بکەن پەشیمان نەبێتەوەو لەهەمان کاتیشدا دەبوایە زانیارییە گرنگەکانیان پێرابگەیاندایە. ئەو تووشی دڵەڕاوکێیەک بوو، هەستی دەکرد دڵی خێراتر لێدەدا و توانای دەربڕینی ڕای خۆی نەبوو. هەستا چووە دەرەوەو دەستی دەریای گرت و جانتاکەی هەڵگرت، بەبێ ئەوەی قسەیەک لە دەمی بێتە دەرەوە. وەک ئەوەی هێزێکی دەرەکی ئەم کارەی پێبکا. دەریاش لەم هەڵوێستەی ئاڤێستا سەری سووڕما، بەڵام دەیزانی هەردووکیان پێکەوە ژیانێکی خۆش بەسەردەبەن، ئەو بڕوایی بە هەستەکانی خۆی و سیگناڵەکانی دڵی هەبوو. هەر لە ڕێگەی ئەمەوە دەتوانێ ڕێزان و هەتاو بدۆزێتەوە. لە دڵەوە هەستی دەکرد ئەم ژنە سەرەتای ژیانێکی نوێی پێدەبەخشێ. هەردووکیان تا گەیشتنە ماڵەوە بێدەنگ بوون. دەریا نەیدەوێرا دەمی بکاتەوە نەوەک شتێ بڵێت و ئەو بەدڵی نەبێت. هەردووکیان کۆمەڵێ بیرۆکە مێشکی خەریک کردبوون. گەیشتنە ماڵەوە، ئاڤێستا وتی «هێشتا ژوورم بۆ ئامادە نەکردووی، دەچین نانێک دەخۆین پاشان دەچین بۆ ئیکیایە بە دڵی خۆت ژوورەکە هەڵبژێرەو شەرمیش مەکە، حەزدەکەم ژوورێک بێت کە تێیدا هەست بە خۆشی و ئارامی بکەیت.». ئەم قسانەی هێمنییەکی خستە دەروونی دەریایەوە. دەریا هەرگیز وا نیگەران نەبووە، ئەو دەیزانی ئەم ژنە ئەو کەسەیە کە دایکی بۆی باس کردووە. دایکی پێی وتبوو دوا جار ژنێکی کورد دەبێتە دایکی ڕاستەقینەت و هەروەک من خۆشی دەوێت و ئاگادارت دەبێت. لەسەرتاوە تواناکانی خۆتی بۆ باس مەکە. ئەگینا لەوانەیە بترسێ و بتگەڕێنێتەوە بۆ لای سویدییەکان.

دەریا لە هەموو هەڵسووکەوتێک و قسەکردنێکیدا زۆر ئاگاداربوو.

هەردووکیان بیریبیان لە بابەتێک دەکردەوە قسەی لەسەربکەن، بەڵام کەسیان نەیاندەویرا سەری دەزووی باسێک بدۆزنەوە. هەردووکیان نیگەران بوون، لەوەی ئەوی تر بێزارنەکەن. ئاڤێستا وتی:

ـماڵەکەی من، ماڵەکەی هەردووکمان دەکەوێتە ئەم گەڕەکەوە، خۆت دەزانی ئەم ناوچەیە پێی دەوترێ سوێدەر و لە قاتی چوارەم دەژییتن. دوو ژووری نوستن و هۆڵ و موتبەخێکی تێدایە.
ـمن بەردەوام حەزم لێبووە لەم ناوچەیە بژیم.
دەریا بەم قسانە زۆر دڵی خۆشبوو بەتایبەتی دەیەوێ لەمڕۆوە ئەم ماڵە ببێ بە ماڵی هەردووکیان، لە دەروونیدا هەستی بە هاتنی ڕووناکییەک کرد. چاوەکانی نوقاند و لە دڵەوە سوپاسی دایکی کرد. لە ئۆتۆمۆبیلەکە دابەزین و خێرا جانتاکەی خۆی هەڵگرت. دەرگاکەی کردەوەو وتی «ها ئەم کلیلەش هی تۆ دەبێت، بەڵام دەبێت ئاگات لێبێت ونی نەکەی.»

ماڵەکەی ئاڤێستا زۆر خۆش بوو، زۆر جیاواز بوو لە هەموو ئەو ماڵانەی پێشتر تێدا ژیاوە. پڕیبوو لە گوڵ ومۆم. لە هەموو سوچێکی ماڵەکەیدا جێگای گوڵ و مۆمی کردبووەوە. ئاڤێستا یەکسەر جلەکانی داکەندو چووە موتبەخەکەو وتی «هەردووکمان برسیمانە، با خواردنەکە گەرم بکەینەوەو نانبخۆین پاشان دەتوانم ژوورەکانی ترت نیشان بدەم.» ئاڤێستا خواردنی ئامادەکردبوو، چووە موتبەخەکەو خواردنەکە گەرم بکاتەوە. ئەم نەیدەویست لەسەرەتاوە لەگەڵیدا زۆر کراوە بێت. بۆ ئەوەی بتوانێ پاشتر کۆنترۆڵی بکات. هەروا دکتۆرە دەروونناسەکەش ئەوەی پێ وتبوو کە دەبێت وردە وردە لەگەڵیدا بکرێتەوەو دەرگا بە

دەرگا بکەیتەوە نەک هەمووی پێکەوە. لە سەرەتادا پێویست ناکات پێی بڵێت تۆ چیت دەوێت بۆ ئەوەی بتوانی کەسایەتی ئەو وەک خۆی ببینی. ئەم شتانەت بۆ باسدەکەم لەبەرئەوەی من هەموو ئەو ڕاپۆرتانەم لە بەردەستدایە کە لەسەر ئەم کچە نووسراوە. پاشتر گەر ویستت دەتوانی بیانخوێنیتەوە. من ئێستا نامەوێ ئەم ڕاپۆرتانە بخوێنیتەوە لەبەر ئەوەی نەکەویتە ژێر کاریگەری خەڵکانێکی ترەوە. من دەمەوێ خاوەنی بۆچوون و تێگەیشتنی خۆت بیت. زۆر جار کەسانێکی وەک ئەم کێژە لە زۆر ڕووەوە زوڵمیان لێدەکرێ.

ئاڤێستا هەمان ڕای هەبوو. ژیان ئەوەی فێرکردبوو کەسەکان بۆچوون و تێگەیشتنی جیاوازیان هەیە. هەر یەکەش بۆچوونەکەی خۆی بەڕاست دەزانێ. هەر یەکە لە گۆشەنیگای خۆیەوە سەیری ڕووداو و شتەکان دەکات. هەندێ جاریش بۆچوونەکان دەربڕی بەرژەوەندی تەسکی تاکەکانە. کاتێ کەسانێک دەکەونە بەر حوکمی ئەو بۆچوونانەوە، ئەوا زاڵمانە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت و ڕەوتی هەموو ژیانیان تێکدەدا. ئاڤێستا نایەوێ ئەو شتانە بخوێنێتەوە لەسەر ئەم کێژە، لەلایەن خەڵکانێکی ترەوە نووسراوە. لەگەڵ ئەوەی گەنجە بەڵام ئەزموونەکانی ژیانی فێری زۆر شتی کردووە.

دەریا بە وردی سەیری ئەو ژوورەی کرد، هەموو شتەکان شوێنی تایبەتی خۆیان هەبوون. لە لێواری پەنجەرەکە چوار جۆر گوڵی لەسەردانرابوو. بە دیوارەکەوە تابلۆیەک هەڵواسرابوو. لەسەر مێزەکەی قاپێکی پان دانرابوو کۆمەڵێ بەردی وردی لەناودانرابوو، لەگەڵ چەند مۆمێکی شیندا. هەر لەوێدا هەستت دەکرد ڕەنگی شین ڕەنگی هەڵبژاردەی ئەم ژنەیە. دەریا بە هێمنی وتی «دەتەوێ قاپەکان دابنێم، لە کوێدان؟».

کاتێ ئاڤێستا دولاب بە دۆلابی بۆکردەوەو شوێنی هەموو شتەکانی نیشان داو پاشان هەموو دەرگاکانی بە هێواشی دادەخستەوە. دەریا تێگەیشت دەبێت زۆر وریا بێت لە هەڵسوکەوتیدا، چونکە لەوە دەکات ئەم ژنە لە کەسی تر نەکات، شتەکانی زۆر بە ڕێکوپێکی داناوە. دەریا بەئاگادارییەوە قاپ و چەقۆ و چەتاڵ و پەرداخی داناو لە دڵی خۆیدا وتی دەبێت زۆر ئاگاداری هەموو جوڵانەوەیەک و هەڵسوکەوت و قسەکانم بم. بە هەموو دڵم دەمەوێ لەگەڵ ئەم ژنەدا بمێنمەوە، ئەمە هەر ئەو ژنەیە دایکم بۆی باس کردووم. هەموو ئەو ئوسوڵ و ڕێسایانەی لینا فێری کردبوو دەبێت بەکاری بهێنێ، تا ڕازی بێت لای خۆی بیهێڵێتەوە.

لێپرسراوەکان یەک مانگ موڵەتیان دابوو پێی، گەر ئاڤێستا لێی ڕازی بێت، ئەوا ئیتر هەموو فۆرم و دۆکومێنتە پێویستەکان پڕدەکەنەوە. ئەم بڕیارەیان دا لەبەرئەوەی ئەو ماڵانەی دەریا دەچووە لایان پاش ماوەیەکی کەم پەشیمان بوونەتەوەو دەریایان گەڕاندوە بۆ بنکەی منداڵانی بێ لانە. هەر بۆیە بە باشیان زانی ئەمجارە موڵەتی مانگێک بە ئاڤێستا بدەن. گەر پاش ئەم ماوەیە هەردووکیان بەیەکەوە گونجان و یەکترییان بەدڵ بووە ئەوا ئاڤێستا بە شێوەیەکی فەرمی دەبێتە لێپرسراوی دەریا.

پاش نانخواردن ئاڤێستا ماڵەکەی نیشان دا، دەرگای ژوورێکی کردەوەو وتی ئەم ژوورە دەبێت بە ژووری تۆ. گەر ڕەنگی دیوارەکەت بەدڵ نییە، ئەوا دەتوانین بیگۆڕین، سەرداری برام دەتوانێ یارمەتیمان بدات کە بۆیەی بکەین. ئێستاش چایەک دەخۆمەوەو دەتوانین پێکەوە بڕۆین بۆ ئیکیا و بە ئارەزووی خۆت ژووری نووستنەکە هەڵبژێرە. خۆ چوویت بۆ ئیکیا ؟ گەورەترین دوکانی مۆبیلیا فرۆشتنە. شتەکانیان

جوانن و نرخەکانیشیان گونجاوە. من خۆم نەمویست بەبێ ڕای خۆت ژوورەکـەت بۆ بکرم. ئەم قسەیە تـەواو دڵی دەریـای خۆشکردو وا هەستی کرد کە ئاڤێستا یەک دڵە لە هەڵگرتنەوەی ئەو، ئەگینا وا بیری لەکڕینی ژوور و بۆیاخکردنی ژوورەکەی نەدەکردەوە. بۆیە باوەشێکی پێداکردو ئاڤێستاش توند لە ئامێزی گرت. فرمێسکەکانی دەریا بەبێدەنگی کەوتنە سەر ڕوومەتە ناسکە گەنمڕەنگییەکەی. ئاڤێستا وتی «تا ژووری نووستنەکەت بۆ ڕێکدەخەین دەتوانی لەگەڵ مندا بخەوی، سیسەمەکەم گەورەیە«. ئەم ڕستەیەی دوایی لێدانی دڵی دەریـای خێراترکردوو ئەو شەوانەی بیرکەوتەوە کە لەگەڵ دایکییدا پێکەوە لەسەر یەک جێگا دەخەوتن. ئەو شەوانە کەمبوون. خێرا زنجیرەی بیرۆکەکانی بڕی. گەر بـەردەوام بێت ئەوا لەوانەیە فرمێسکەکانی تەنگی پێهەڵچنی، ئەمیش نایەوێ ئاڤێستا لەسەرەتاوە هەموو شت لەسەر ژیانی بزانێ.

ژووری نوستنەکەی گەورە بوو، دوو پەنجەرەی گەورەی تێدابوو کە ڕوویانکردبووە باخچەی ناوچەکەو پەردەیەکی فستقی کاڵیان پێوە بوو، دوو مۆمدانی سەوز بە پەنجەرەکەدا هاتبووە خوارەوە. دوو وێنە لە ژوورەکەیدا هەڵواسرابوو، وێنەی باوکی. باوکی پێشمەرگەبوو، لە شەڕێکی سەختدا دژ بە سوپای سەدام شەهیدبوو. وێنەکەی تر، وێنەی بودا بـوو. چەند مۆمێک لە ڕەنگە جیاوازەکانی سـەوز ژوورەکەی ڕازانـدبـووەوە. لە سوچێکی ژوورەکـەیـدا دۆشەکێک و سەرینێکی درێژکوولە دانرابوو. ئەو شوێنەش شوێنی میدتەشوونەکانی بوو. لە چاوەکانی ئاڤێستادا کۆمەڵێ وێنەی بە تێکەڵاوی بینی، ئەوانیشی لەسەر بیری سڕییەوە. ئەو وێنانە ترسی لە دەروونیدا دروستکرد. ئەمیش نایەوێ ترس بکەوێتە نێوانیانەوە.

دەرگاکەیان داخست و سواری ئۆتۆمۆبیلەکە بوون بەرەو ئیکیا چوون.

دەریا دەیویست کرینی ژوورەکەی بداتە دەست ئاڤێستا. ئەو نەیدەزانی داوای چ جۆرە ژوورێک بکات و بایی چەند بێت. ئەمە جگە لەوەی ئەمە یەکەمین کەسە کە بڕیاری هەڵبژاردن دەداتە دەست خۆی. هەموو ئەو خێزانانەی کە ئەم چووەتە لایان ئاوا بەڕێزەوە سەیرییان نەکردووە، ئیتر لە دایەگەورەو بابەگەورەیە تا ژنەکەی باوکی و تا دوا خێزان. ئەو هیچ کاتێ هەستی بە خۆشەویستی بەرامبەر دایەگەورەو بابەگەورەی نەکردووە. کاتێ دایەگەورەی زانی لینا نەخۆش کەوتووەو مردووە، بەهیچ شێوەیەک نەیانویست کچەزاکەیان بگرنە خۆیان و دەیانووت ئەم کیژە سەری شوومە. خۆ دەریاش بەهیچ شێوەیەک نەیدەویست بچێتەوە لایان، چونکە هەر کە ئەوانی دەبینی ئەو ساتانەی دەکەوتەوە یاد کە بەهیچ شێوەیەک نەیدەویست بێتەوە یادی بەڵکو دەیویست ئەو شتانەی کە ڕووی داوە لە مێشکیدا بیسڕێتەوە و سەرلەنوێ ژیانێکی نوێ دەست پێ بکات. بەڵام هەرگیز نەیدەویست  ئەو ساتە کەمانەی لەگەڵ دایکیدا بەسەری بردووە لەیادی خۆی بەرێتەوە. هەر ئەو ساتانە بوو کە خۆشی پێدەبەخشی و هێزی دەدایە کە بەرگری ئەو هەموو سەختیانەی ژیان بکات کە پاش مردنی دایکی بەسەری هات. ئەو دەیزانی دایکی مردنی هەڵنەبژارد، خۆشەویستی ئەم ڕێگای نەدەدا پێی ئەو کۆتاییە هەڵبژێرێ. لە یادییەتی کە شەوان دەیخەواند بە دیارییەوە دادەنیشت و دەیگوت»دەریا گیان دەزانم ژیانم زۆر گرانە و ئازار زۆر دەدرێم بەڵام هیوام بەوەیە کە هەردووکمان پێکەوە بتوانین ڕووبەڕووی ناخۆشییەکانی ژیان ببینەوە. من چاوەڕوانی ئەوە دەکەم تۆ گەورەبیت. بتوانین پێکەوە قسەبکەین. چاوەڕوانی ئەو کاتە دەکەم لێرە نەمێنم و هیچ نەبێت لەبەرخاتری تۆ سەرلەنوێ دەست پێبکەمەوە. تۆ گەورەببە و خەمی دایەت نەبێت، بەڵێنێت پێدەدەم نەیەڵم وەک من ئازار بدرێیت، گەر ژیانیشم لە پێناوتا دانابێت.»زۆربەی شەوان هەمان

قسەی دەکردەوە، ئەم قسانە وەک گۆرانی و لایەلایەی لێهاتبوو. بۆیە دایکی هەرگیز ئەو بڕیارەی نەدابوو. ئەو دڵی نەدەهات ئەم بەتەنیا جێبهێڵێ. هەموو شەوێ کە دەخەوت هەمان ئەم وشانەی دووبارە دەکردەوە. هەر ئەم وشانەش بوو هێزی پێدەبەخشی و مانای دەدا بە ژیانی. بەردەوامیش بە ئاواتەوە بوو هەتاو و ڕێزان بدۆزێتەوە. ئەوانە تاقە کەسانێک بوون کە دایکیان لە دڵەوە خۆش ویست و تکایان لەدایکی کرد کە نەگەڕێتەوە ماڵی باوکی. خۆ خۆشی پێشبینی ئەوەی دەکرد کە کارەساتێک ڕوودەدات. هەموو تواناکانی بەکارهێنا تا ئەوەی ڕوویدا ڕووی نەدایە. دیارە چارەنووسی دایکی وابوو. کەسیش ناتوانێ بەرەنگاری چارەنووس بێتەوە. هەرگیز نە لە دایەگەورەو نە لەبابەگەورەو نە لە باوکی خۆش نابێت. ئەو تاوانەی ئەوان بەرامبەر دایکی کردیان هیچ دڵێک بەرگەی ناگرێ. هەر ڕۆژێک دەبێت مەرگیان نیشان بدات. ئاڤێستا زنجیرەی بیرکردنەوەکانی دەریای پچڕاند و وتی «تەماشاکە، ئەمانە چەند ژوورێکی نووستنی کچانەیە، جگە لە سیستەمەکە، دۆلابێک هەڵدەبژێرین، مێزێکی نووسینیش دەکڕین. دەتوانین هەرلێرەش فەرشێک و پەردە هەڵبژێرین. بەڵام دەبێت لەسەرەتاوە ژووری نووستنەکە هەڵبژێری تا بەپێی ڕەنگی جێگەکەت ئەوانی تر بکڕین.»

نیگا پڕ لە ترس و نزاکانی دەریا، دەروونی ئاڤێستای هەژاند. بۆ یەکەمین جار وا بە وردی ڕوانییە چاوەکانی و لە ترس و نزاکانی گەیشت. لەسەر یەکێک لە جێگەکان دانیشتن و دەستی دەریای ڕاکێشاو گرتیە باوەشییەوە. بە نەرمی و بە خۆشەویستییەوە دەستی بەسەریدا هێناو وتی «دەریا گیان لە چی دەترسی، من تۆم هێنا بۆ لای خۆم تا وەک کچێکی خۆم پێکەوە بژین، دڵنیا بە ئازارت نادەم، هەوڵدەدەین ژیانمان

خۆش بێت. هەر لە ئێستاوە داوات لێدەکەم هیچم لێ مەشارەوە، هەرچییەکت دەوێت لەگەڵم باسی بکە. من دەزانم زۆر ئەمسەرو ئەوسەرت پێکراوە، لەگەڵ زۆر خێزان ژیاویت و لەگەڵ هیچ لایەکیاندا هەستت بە ئارامی نەدەکرد. من نازانم بۆ وات لێهاتووە، بەڵام بەڵێنت پێدەدەم هەوڵدەدەم ئەمە دوا ماڵت بێت تا ئەو کاتەی شوودەکەیت و دەچیتە ماڵی خۆت.»

دەریا لە دەنگ و شێوەی قسەکانییدا دەنگ و ڕەنگی دایکی تێدا بینییەوە، بۆیە خۆی پێڕانەگیرا و باوەشی بە ئاڤێستا کرد و بەکوڵ گریا. هەموو ئەوانەی بەلایاندا تێدەپەڕین تەماشایان دەکردن. ئاڤێستا ئەمجارەش توند دەریای لە ئامێزگرت و فرمێسکەکانی سڕییەوە وتی «دەی هەستە، یەکە یەکە لەسەر هەموو جێگاکان ڕادەکشێن بزانین خەوتن لەسەر کامییان خۆشتربێت ئەوەیان دەکڕین. ترسیشت نەبێت پارەم هەیە، بۆیە گوێ نادەینە نرخەکەی. ئا لەو ساتەدا لەسەر یەکێ لە جێگاکان دایکی بینی، خێرا بەرەو جێگەکە ڕۆیشت تا باوەش بەدایکیدا بکات. لەسەر جێگەکە پاڵکەوت، فریا نەکەوت باوەش بە دایکیدا بکات بەڵام هەستی بەگەرمی دایکی و بۆنی دایکی کرد. یەکسەر بە ئاڤێستای وت»ئەمەیانم دەوێت».

«زۆرباشە! گەر وا بڕوات زۆر بەزوویی دەتوانین شتەکانی تر هەڵبژێرین. دەتوانین لەگەڵیان ڕێکبکەوین هەر سبەینێ شتەکانمان بۆ بهێننەوە و ئێوارەکەشی بە سەردار دەڵێن بێت شتەکانمان بۆ دابنێ. لەوانەیە بتوانیت سبەی لە ژوورەکەی خۆتدا بخەوی». دەریا ویستی بڵێ ئەم هێندە پەلەی نییە لە ژوورەکەی خۆیدا بخەوێت،

بەڵام قسەکەی خۆی گەڕاندەوەو بێدەنگ بوو. چونکە نەیزانی هەستی هەردووکیان چۆن دەبێت گەر پێکەوە لەسەر یەک سیستەم بخەون. ئاڤێستا دەستی برد و دەستی دەریای گرت. خۆشی و ئارامییەکی زۆر جەستەی هەردووکیانی گرتەوە. زیاتر لە دوو سەعاتیان پێچوو تا هەموو شتەکانیان کڕی و پارەی هێنانەوەی شتەکانیشیان دا. ئەوجا هەردووکیان بەرەو ماڵەوە ڕۆشتنەوە. ئاڤێستا پرسی»دەتەوێ براکەم ببینی، ناوی سەردارەو دوو ساڵ لەمن منداڵترە. ئەو لەگەڵ کچێکی فارسدا دەژییێت. ئەو خەریکی خوێندنە و زۆر زیرەکە«ئاڤێستا تەلەفۆنی کرد بۆ سەردار»چۆنی سەردار گیان... خوێندنەکەت چۆنە... ئەی مینا چۆنە.... سبەی کاتت هەیە بێت بۆ لامان... کچەکەم ببینی... دەستی کردە پێکەنین و بەردەوام بوو لە قسەکردن. نا هیچت پێ ناڵیم تا خۆت نەیەیت. ئێستا ئێمە لە ئیکیا هاتینەوە، ژوورێکمان بە دڵی خۆی کڕی، جا گەر سبەی بێت ئەوا دەتوانی بیبینی و ژوورکەشی بۆ دابنێی. ... نا پەشیمان نابیتەوە«.

تەلەفۆنەکەی داخست. وشەی کچەکەم هەستەکانی دەریایی وەک گۆمێک شڵەقاند، لەلایەکەوە ئەو هەر خۆی بەکچی دایکی دادەنێت و بڕیاری داوە بە کەسێکی تر نەڵێت دایە. لەلایەکی تریشەوە دڵخۆش بوو بەوەی ئەو هەر لەیەکەمین ڕۆژەوە وەک کچێکی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. بەڵام هەموو ڕێگەکە بێدەنگ بوو، ئاڤێستا هەندێ جار لایەکی بۆ دەکردەوەو بزەیەک دەیگرت، بەڵام هیچ قسەی نەدەکرد. ئەو بزەو بێدەنگییە دەریایی دەخستە گومان و ترسەوە. دەبێت ئەم بزەو بێدەنگییە مانای چی بێت. لەماوەیەکی کورتدا زۆری دەردەسەری بەسەرهات، ئەمانە هەمووی وایلێی کردبوو بڕوا بەکەس نەکات. لەگەڵ ئەوەی ئەو توانایەکی باشی هەبوو لە تێگەیشتن و بینینی شتەکان بەڵام

لەم چەند ساڵەی دواییدا بەهەموو شێوەیەک دەیویست پەردەیەک بەسەر ئەو توانایانەی خۆیدا دابداتەوە، بەتایبەتی پاش ئەوەی چووە لای ئەندەش و لینا.

ئاڤێستا لەلای خۆیەوە بیری لەوە دەکردەوە ئەم کچە بۆ هێندە بێدەنگە و لەو ترس و گومانە نەدەگەیشت  لە چاوانیدا دەیبینی. لایەکی بۆ کردەوەو وتی «ماندووی وانییە؟ کە ڕۆیشتینەماڵەوە خۆمان دەشۆین و هەندێ دۆندرمە دەخۆین و دەخەوین، تەنیا ویستم بزانم ڕات چییە گەر ئەمساڵیش لە هەمان قوتابخانە بمێنیتەوە و ساڵی داهاتوو بتهێنمە ئەم قوتابخانەیەی نزیک خۆمان، دەمەوێ ڕای خۆتم پێ بڵێی بەبێ شەرم.»پاش تۆزێ بیرکردنەوە و جۆرە دوو دڵییەک وتی «حەز دەکەم بێمە ئەم قوتابخانەی ئێرە، وا بزانم بۆ تۆش و منیش خۆشترە کە نزیک بم، گەر وا نزیک بین ئەوا خۆشم بە تەنیا دەتوانم بگەڕێمەوە. بەڵام دەتوانی بە قوتابخانەکە بڵێت کە من کچی تۆم، تا لەوە زیاتر منداڵەکان گاڵتەم پێنەکەن.»ئاڤێستا هەڵوێستەیەکی کرد  و وتی «بۆ گاڵتەیان پێکردوویی، ئەی بە مامۆستاکانت وت. ئەی بە لێناو ئەندەشت وت... چۆن ڕێگە دەدەن گاڵتە بە تۆ بکەن ئەی نازانی ئەوە قەدەغەیە...»فرمێسکەکان بەبێ ویستی ئەو هاتنە خوارەوە. ئاڤێستا خێرا ئۆتۆمبیلەکەی وەستاندو هاتە دەرەوە. دەریای بردە پارکێک کەلە نزیک ئەو شوێنەدابوو. لەسەر کورسییەک دانیشتن و باوەشی پێداکرد و وتی «چۆن ڕێگەیان داوە منداڵەکانی پۆلەکەت شتی وا بکەن، خۆت دەزانی من وەک مامۆستا لە قوتابخانە کاردەکەم، دەبێت بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانە  بکەوێتە کار تا کاری لەم بابەتانە بووەستێنرێ. با سبەی بڕۆم بۆ قوتابخانەکە بزانە چییان پێدەکەم، سبەی هەر مەڕۆ بۆ ئەو قوتابخانەیە. پێکەوە دەچین بۆ ئەم  قوتابخانەیەی نزیکی خۆمان. هەر

لەوێ داوای شوێن دەکەین. خەمت نەبێت نایەڵم جارێکی تر ئەو کاره دووباره بێتەوه.»ئەم هەڵوێستەی ئاڤێستا دووباره هێمنی وئاسوودەیی خستەوه دڵی دەریا.

شەو زوو هات. سەخترین سات بۆ دەریا شەوبوو. له تاریکی و بێدەنگی دەترسا، له خەوەکانی دەترسا. تەنیایی و تاسەی دایکی دەستی دەخستە بینەقاقای. ئەو وەک هەموو منداڵانی تر دایکی نایەت شەوباشی لێبکات. ئەو بێبەش کرا له ئامێزو دەست لەملانێی دایکی. خەمەکانی دەریا قووڵە. ئەو تا ئێستا نەیتوانیووه نهێنی مردنەکەی دایکی ئاشکرا بکات. ئەو هەنگاو به هەنگاوی ئەو تاوانه دەزانێ. بەڵام ناتوانێ ئاشکرای بکات، چونکه نازانێ چۆن، لەوانەیه گەر باسیشی بکات کەس باوەڕی پێ نەکات. ئەمشەو تا ڕادەیەک هێمنه، لەبەرئەوەی لەگەڵ یەکێکی تردا دەخەوێ. ئەمشەو یەکێکه لەو شەوانەی دەتوانێ به ئارامی خەوبیباتەوه. ئاڤێستا کۆمەڵێ جل و پێداویستی بۆ دەریا کڕیبوو. دەریای بانگ کردوو جلەکانی نیشان دا. دەریا جلەکانی زۆر پێ جوان بوو. دەریا سوپاسی کرد و وتی «من جلی ترم زۆره دەبێت بیانهێنم بۆ ئێره.»ئاڤێستا وتی «دەزانی بڕیارم داوه هیچ شتێکی کۆن بەکارناهێنین، هەمووی نوێ دەکەینەوه. هەردووکمان دەست دەکەین به ژیانێکی نوێ، بۆیه هەموو شتەکانمان دەبێت نوێ بێت. بەڵام ببووره بیرم چوو کتێبت بۆ بکڕم، تا پێش خەوتن بۆت بخوێنمەوه، ئەوەندەش چیرۆک نازانم تا شەوانه بۆت بگێڕمەوه.»

ئەو شەوه دەریا به ئارامی و له پاڵ ئاڤێستادا خەوی لێکەوت. دڵنیایی وخۆشییەکی سەیرت له دەموچاویدا دەبینی. ئەو شەوه ئاڤێستا خەوی لێنەکەوت، به دیار دەریاوه دانیشتبوو. فرمێسک دەهاته خوارەوه به

چاوانیدا و بیری لەو کچە دەکردەوە، پێش چوار ساڵ لەباری خۆیی برد. ئێستا خۆزگە دەخوازێت ئەو کارەی نەکردایە. ئەگینا ئێستا کچێکی جوانکیلەی سێ ساڵان و نیوی هەبوو، وەک کەروێشک بە ماڵەکدا دەهات و دەچوو. وەک هەتاوی بەهار خەمەکانی دەتواندەوە. هەر بۆیە بڕیاریشی دا کچێکی کورد هەڵبگرێتەوە. ساڵ و نیوێکە بەدوای منداڵێکی کورددا دەگەرێ. خۆشی نەیدەزانی بۆ ئەم خاڵەی کردبووە خاڵی سەرەکی. ئەو نە لەگەڵ کورددا تێکەڵ دەبێت و نە دەیەوێ بچێتەوە بۆ کوردستان. زۆر جاریش دەیەوێ ڕەگی خۆی لەو خاکەدا هەڵکێشێ کە تێدا لەدایکبووەو تێیدا سووکایەتی پێکراوە ونرخی خۆیی تێدا دۆڕاندووە. هەندێ جاریش دەڵێ خۆزگە بیکوشتمایە و ڕزگارم بووایە لەم هەموو ئازارە. جاری واش هەیە دڵی خۆی دەداتەوە دەڵێت هەر باش بوو لەگەڵ براکەمدا ناردمییە دەرەوە و توانیم ژیانێکی نوێ دەست پێبکەم. پاشان دەڵێت ئەو سەگبابە خۆ لەبەر خاتری من ئەم کارەی نەکرد، بەڵکو لەترسی خۆی و پاراستنی دەستەڵاتەکەی بوو. لەوانەیە گەر کەس بە پەیوەندییەکەی نەزانیایە ئەم کارەی نەکردایە. ئەمە جگەلەوەی لەدواییدا من خۆم گورج کردەوەو شوولم لێهەڵکێشاو پێمووت من باسی پەیوەندییەکەی خۆمم بۆ ژنێکی نووسەر کردووە، ئەو بەتەمایە بەسەرهاتەکەم بکاتە چیرۆکێ. هەر لەو کاتەشدا بوو شتی لەو بابەتانە لە ڕۆژنامەکاندا زۆر بڵاودەکرانەوە. هەموو شەوەکە ئاڤێستا خەوی لێنەکەوت، سبەی دەبێت کاربکات. بەلایەوە گرنگ نەبوو، ئەو لە سبەینێوە ژیانێکی نوێ دەست پێدەکات.

لەو ڕۆژەوە ژیانی هەردووکیان گۆڕا، ئاڤێستا ئەو خۆشەویستی و گەرمییەی کە دەبووایە بیدایە بەو کۆرپەیەی لەباری خۆیی برد، دای بە دەریا. دەریاش هیوای پەیداکرد لەمەودوا ژیانێکی ئاسایی بباتە سەر.

له ناوەوەی خۆیدا هەستی دەکرد ژیان لەگەڵ ئاڤێستا سەرەتای ئەو ژیانەیە کە دەمێکە چاوەڕوانییەتی. حەزی دەکرد کات خێراتر بڕوات. وەڵامی ئەو پرسیارانە وەرگرێت کە دەیەوێت لە ئاڤێستای بکات. خۆ ناکرێ هەر لەسەرەتاوە پرسیاربارانی بکات.

- 5 -

هەتاو بە ڕووداوە تازەکان دڵی خۆشبوو، لە دەموچاویدا ئەو ئارامی و خۆشییە دەبینرا. کەسیش هۆکەی نەدەزانی. دەریا لای ئاڤێستا ناوێک جێگیربوو. هانس و نەورۆز تا دەهات پەیوەندییەکەیان بەهێزتردەبوو. بەردەوامیش ئاگاداری گۆڕانکارییەکان بوو. ئەمەش لە سایەی دەرکەوتنی ئۆڵگا بوو، وەک چرایەک وابوو بۆی. سەری هەموو تاڵەدەزووەکانی دەدا بەدەستیەوە. لەهەمان کاتدا ئۆڵگا بەهیچ شێوەیەک نەیدەتوانی لە باس کردنی ئیگۆر بوەستێ. هەر هەلێکی دەست بکەوتایە خێرا ئیگۆر دەبووە پاڵەوانی باسەکانی. هەتاو تا ڕادەیەک لەمە بێزارببوو، لەگەڵ ئەوەی بەوردی گوێی بۆدەگرت.
ئەو کاتەی ئیگۆر گەرایەوە بۆ مۆسکۆ منیش لە ڕۆما مامەوە. باری دەروونییم زۆر تێکچوو لەگەڵ ئەوەی نەمدەویست ئەو نائارامییەم نیشان بدەم. هەموو کاتەکانی خۆمم پڕکردەوە بۆ ئەوەی بوار بەخۆم نەدەم بیر

له ئیگۆر و ماچەکانی و ئامێزه گەرمەکەی و نیگا پڕخۆشەویستییەکەی بکەمەوه. کەچی بەبێ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێت لەگەرمەی کارەکانمدا هەموو بیرەوەرییەکانم لەگەڵ ئەودا سەری بەرزدەکردەوەو بیرو هۆشمی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. هەستم بە گەرمی سەرپەنجەکانی دەکرد کە دەیهێنا بەسەر هەموو جەستەمدا، وەک ئەوەی بەدوای گەوهەری ناو ماسوولکەکانمدا بگەڕێ. پەنجەکانی لە قژم دەئاڵاند و بۆنی بە قژمەوە دەکرد، وەک ئەوەی پەنجەکانی لە قەدی ناسکی گوڵەنێرگس ئاڵاندبێت. تەواو بێدەنگبوو، سەیری چاوانم دەکرد لێشاوێک لە وشەی دڵداری وەک شنەی با بەرەو ڕووم دەهات و دڵمی فێنک دەکردەوە. نەمدەزانی چۆن خۆم لەو هەستە دەربازبکەم. زۆر جار دەمویست پەیوەندی پێوەبکەم و گوێم لە دەنگی بێت دوایی پەشیمان دەبوومەوە. هێندە بیرم لەو دەکردەوە تەنانەت هەموو ئەو ساتانەم بیردەکەوتەوە کە پێکەوە لە کۆلێژ بووین. هەموویم بە وردەکارییەکانییەوە بیرکەوتەوەو دەڵێم چۆن من ئەو کاتە ئەو خۆشەویستییەی ئەوم نەدەبینی. ئێستاش وا دیارە هیچ لەو واقیعە ناگۆڕێت. کات ناگەڕێتەوەو ئەوەی ڕوویدا هیچ هێزێ ناتوانێ بیگۆڕێ. ئەم ڕاستییە ئازارێکی قوڵی لە دەروونمدا دروستکرد بووە زادەی ئەو هۆنراوانەی لە ماوەیەکی هێندە کەمدا نووسیوومە. خۆشم سەرم لەوە سوڕما چۆن هەستەکانم دەبوونە وشەو بەسەرما دائەبارین. هەندێ جار فریا نەدەکەوتم بیانووسمەوە، لە خەونیشدا هۆنراوەم بۆ دەهات. بەس لەماوەی تەنیا دوو مانگدا دیوانێکی شیعریم نووسی، سێ سەد پارچە هۆنراوەی تێدابوو. ئەو کات زانیم خۆشەویستی بەهێزترین سەچاوەی ئیلهامی داهێنانە. خۆری خۆشەویستی لە دەروونی ئەوانەی خاوەن گەورەترین داهێنانن هەرگیز ئاوانابێت و جەستەیان ئاشنای تاریکی نابێت. من ئێستا پەشیمانم لەوەی بەو شێوەیە کۆتاییم بە ژیانم هێنا. نەدەبوو وا بکەم.

دەبوو بۆ خۆشەویستی بجەنگامایە. بینیمان من ژیانی سەرزەمینیم بەجێ هێشت و نە ئەو بەختەوەرە نە ژن و منداڵەکانی. من زوو خۆمم دا بەدەستەوە، نەمدەزانی چۆن بۆ خۆشەویستەکەم بجەنگم. ئەوەش لەبەرئەوەی لەهەموو ژیانمدا هەموو ئەو شتانەی ویستوومە بە ئاسانی بەدەستم هێنان. وەک گەنجێکی بیست ساڵان ئەوەی خەوم پێوە بینی، لە چاو تروکانێکدا هاتە بەردەستم. لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەندا ژیانم بردەسەر. زۆربەی وڵاتانی جیهان گەڕام و لە باشترین هوتێلەکاندا دەژییتاین. ئەوەندەشی پارە بۆ هەڵگرتبووم بەبێ ئەو، چەندان ساڵ بەهەمان شێوە بژیم. تەنانەت سەروەتو سامانەکەی بەناوی منەوە نووسیبوو. ئەو چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد من پێش ئەو بمرم. زۆر جار دەیوت بیرت نەچێت هەموو هەفتەیەک بێیتە سەرگۆڕەکەم و چەپکێ گوڵم بۆ بێنی. ئێستا ئەو لەگەڵ ژنێکی هاوتەمەنی خۆیدا دەژییت. زۆر بەختەوەرە. ڕاستە منی لەیادنەکردووەو هەموو دیوانە شیعرەییەکانی لە ژووری کارەکەی خۆی داناوەو هەمان وێنە کە لەسەر مێزەکەی بوو لە شوێنی خۆی ماوەتەوە. دیارە گەر من بمامایە، ئەو ژنە ڕازی نەبوو ئەو وێنانە لەو شوێنانە بمانایە. ئیگۆریش تا ئیستا بەردەوام بە دزییەوە دەچێتە سەر گۆڕەکەم گوڵ دادەنێ و هەموو جارێکیش دەچێت دوا دیوانم دەباو دەیخوێنێتەوە. دەزانێ هەموویانم بۆ ئەو نووسیووە. ئەو عاشقێکی ترسنۆک بوو. بە داخەوە تا لە ژیاندا مابووم ئەوەم پێنەوت. دەمزانێ ئەو نایەوێ واز لە ژنەکەی بهێنێ. بەلاَم ژیان لەگەڵ ژنێکدا چ مانایەکی هەیە گەر ژنێکی تری خۆشبوێ. ژیان دەبێتە ژیانێکی ڕۆتینی مردوو، ڕۆحیش دەبێتە شەو. وەک ئەوەی بینیمان. من لێرەوە ناتوانم هیچی بۆ بکەم، خۆی ئەو ژیانەی هەڵبژارد.

دەزانی ئۆلگا ئەم قسانەی تۆ کۆمەڵێ پرسیاری لا دروستکردم. ئەوەش

لەوانەیە لەبەرئەوەی من و تۆ هەمان ئەزموونمان هەیە. هەردووکمان پیاوێکی ژندارمان خۆش ویست لەگەڵ جیاوازیدا. ئێستا ئا لێرەوە زیاتر بیر لە ژیان و ڕووداوەکان دەکەمەوە باشتر دەیانبینم. دڵی مرۆڤ چییە؟ دڵی مرۆڤ شەپۆلێکە لە هەست و بزوێنەری ماسولکەکانەو هەنگاوێکە بەرەو مردن. ڕۆڵی خۆشەویستی چییە لە ژیاندا؟ خۆشەویستی هەناسەی ژیانە. ئەوانەی بە خۆشەویستی دەژیێتن، ژیانیان ئاوازێکە لە پێکەنین. ئەوانەشی کەسێکیان خۆشدەوێت و لەگەڵیدا ناژین، ژیانیان گۆرانییەکە لە شیوەنی ئازار. ژیان بۆ ئەو کەسانەی لەگەڵ یەکێکدا دەژیێتن و خۆشیان ناوێ، گەڕانێکی بەردەوامە بەدوای کەسێک بە هەوای خۆشەویستی بژی. ئا لەم حاڵەدا دەستبەردان لە ژیانی بێ خۆشەویستی دەبێتە سەرکەوتن بەسەر ئەو هەورازەی ناتگەیەنێتە لووتکە. ئالەم حاڵەتەدا پرۆسەی ژیان دەگۆڕێ. کەسێک لە دامێنی چیاکە جێدەهێڵی و بەرەو کەسێکی تر دەڕۆیت لە لووتکەدا چاوەڕوانتە. دەبێت هەڵببژێری! مانەوە لە دامێن و ڕوانینە لووتکە ڕاستە یان دامێن بەجێ هێشتن و هەڵکشان بەرەو لووتکەی بەختەوەری. ئێمەی ڕۆژهەڵاتی ئەم بڕیارەمان پێ زەحمەتە، ویژدان ئازارمان دەدا. من و تۆ دوو شەڕکەری ترسنۆکیین، ئەوانەشی شەیدایان بووین وەک خۆت وتت دوو عاشقی ترسنۆک بوون. ترسنۆکەکان ترسنۆکەکان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن. لەم وڵاتانەی ئێوەدا پیاوێ یان ژنێ زۆر بەئاسانی بەوەی تر دەڵێن ئێستا کەسێکی دییان خۆشدەوێت، دەیانەوێ ژیانێکی نوێ دەستپێبکەن. دەست پێ کردنەوەی ژیانێکی نوێ لەگەڵ ئەو کەسەی خۆشت دەوێت هێندە قوربانی ناوێ. بەڵام لە وڵاتانی ئێمەدا مرۆڤی لەسەر دەکوژرێ.

هەتاو من لەو باوەڕەدام لە هەموو حاڵەتەکاندا مرۆڤ دەبێت لەگەڵ

هەستەکانی خۆیدا ڕاستگۆ بێت. لەبەر کەس نا بەڵکو لەبەرخودی خۆی، چونکە ئەو ڕاستگۆییە سەرچاوەی داهێنان و پێکەنینی ژیانە. ئەوەی منی بەستبووەوە بەو مێردەمەوە ناسکی هەستی و ڕاستگۆیی بوو. هەتا ئێستاش لەو هەستەی خۆم بەرامبەری تێناگەم. دەتوانم بڵێم من ئازاری ئەوم دەدا، بەڵام هێندە منی خۆشدەویست. ئازارەکانی گوڵیان دەگرت. من شەرمەزاری ئەو بووم. دەمزانی هەرچیەکی بۆ بکەم بەرامبەر ئەو عەشقەی ئەو نییە. هەستەکانمان لە دوو لای تەرازوویەکدا بوون، یەکێکیان لە ئاسمان و ئەوی تریان لەسەر زەوی. ئەوەی بەختەوەرم دەکات ئەوەیە ئێستا لەگەڵ کەسێکدا دەژیێت و هەردوو لای تەرازووەکە لەیەک ئاستدان. جا دەزانی بیر لەچی دەکەمەوە؟ ئایا ئەو هەستەی ئەو هەیبوو بەرامبەر بەمن خۆشەویستی و عەشق بوو یان هەستێکی تر. هەندێ جار هەستمدەکرد وەک منداڵێکی نازدار مامەڵەی لەگەڵ دەکردم. بۆیە من گەورەنەبووم، وەک کچە هەرزەکارە بەنازەکەی مۆسکۆ وابووم. نەمدەویست بیر لەتەمەنم بکەمەوە. لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵدا ئەو هەڵسوکەوتی لەگەڵ مندا نەگۆڕی. دەزانی ئێستاش لەوە ناگەم چۆن وا کەوتمە خۆشەویستی ئیگۆرەوە. هەستی خۆشەویستی هەموو جەستەمی داگیرکرد، ئیتر زانیم ئەو هەستەی بەرامبەر مێردە ئازیزەکەم هەمبوو شتێکی تر بوو. نازانم جۆرێکی تر بوو لە خۆشەویستی. بەڵام عەشق نەبوو، دەمزانی من عاشقی ئەو نیم. بەڵام کە عاشق بووم زانیم هەموو ئەو شیعرانەی نووسیوومە تەنیا وشەی بەتاڵ بوون. ئێستا حەز دەکەم بگەڕێمەوە و ئەمجارەیان وەک شاعیرێکی ڕاستگۆ شیعر بنووسمەوە. ئیستا دەتوانم ئەو نهێنییەت بۆ بدرکێنم بۆ من مردنم هەڵبژارد. لەلایەکەوە گەیشتمە ئەو واقیعە تاڵەی من ئەو هەموو ساڵە لەمانای عەشق نەگەیشتبووم و ئەو کەسەشی منی دەگەیاندە لووتکەی لەزەت و بەختەوەری کەسێکی ترسنۆک بوو. نەک تەنیا من بەڵکو

هەردووکمان ئەو هەلەمان لەدەست خۆمان دا، کە لەم ژیانەماندا بگەینە ئەو لووتکەیە. مرۆڤیش هەر یەکجار هەلێکی وای بۆ ڕێدەکەوێ. من دەمتوانی هەروەک جاران لەگەڵ مێردە ئازیزەکەم بەردەوام بوومایە. ئامادەنەبووم، نەمدەویست درۆی لەگەڵ بکەم، ئەو شایانی ئەوە نەبوو. ئەمە جگە لەوەی ئەو هەموو هەستەکانی منی دەخوێندەوە. هەربۆیە ئەو پاش ئەو شەوە هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی لەمندا بینی، داوای لێی کردم بڕۆم. من دەمتوانی نەڕۆم. بەڵام بەجێمهێشت. دەمزانی هەر تێڕاوانینێکی بۆ من خنکاندن بوو لە دەریاچەی شەرمەزاریدا. هەڵوێستی ئیگۆر منی خستە گێژاوێکەوە. واتە لەناو گێژەڵووکەیەکدا بووم دەرچوونم مەحاڵ بوو. گەر بەو شێوە قووڵە منی خۆشدەویست بۆ ئامدەنەبوو لە پێناو ئەو خۆشەویستیەدا ژیانێکی نوێ دەست پێبکات. ئەمە ڕاستییەکەیە. سوپاس بۆ تۆ هەتاو گیان من ئێستا لەهەموو کاتێ زیاتر هەست بەئارامی ڕۆحم دەکەم چونکە لەگەڵ تۆدا گەیشتمە ئەو ڕاستییەی دەمێک بوو نەمدەویست بیبینم. سوپاس بۆ تۆ وا بەوردی گوێت بۆ گرتم. بەڵێن بێت ئیتر لەمەودوا باسی ئیگۆر نەکەم. تەنیا گوێ بگرە، ئەمەش دوا شیعرە کە بۆم نووسییوە.

شەوانی من
من و شەوان بووین بە هاوڕێ
ئەو هێمنی و ئەستێرە لەئامێز دەگرێ
منیش تاسە و دووری تۆ ئۆقرەدەم لێدەبڕێ
بە درێژایی ڕۆژ چاوەڕوانی هاتنی شەو دەکەم
تا سەر بخەمە سەر سەرینەکەم.
بەبێدەنگی و بە شەرمەوە
بکەومە باخەڵی خەیاڵەوە.

لەخەیاڵمدا خۆم فڕێ دەدەمە باوەشتەوە
دەمم دەخەمە ناو دەمتەوە
تا هەناسەکانت بخۆمەوە
مەیی چاوانت بنۆشم
بەسەرمەستی بەبێ ئاگا
پەنجە تامەزرۆکانم
لە ناو قەدی حەزەکانت بئاڵێنم.

گەردوون بەسەر شانمەوەیەو
بەرەو لای تۆ دێم
تۆش بوویت بە هەوراز و
منیش سواری شەپۆلە سەرشێتەکانی هەستم دەبم و
بەرەو ئاسۆیەکی نادیار دێم
هەناسەکانم سوواربوون و هەنگاوەکانم بڕناکەن
وا ماندوو بووم، دەمەوێ بگەڕێمەوە
گومانم هەیە لەوەی تۆ شایانی
ئەم کۆڵەخەمەی من بیت.
من لەوە زیاتر ناتوانم ئازاری دووری تۆ بچێژم
تۆ منت تا نیوەی ڕێگا هێناو
منیش گەیشتمە نیوەی ڕێگای تاریکی، بەرەو لای تۆ
تۆش چرات بۆ هەڵنەکردم و نیگاکانت وەرگێڕا لێم
گوێت لە ئاوازی ترپەی دڵم نەگرت
بڕیارم دا بگەڕێمەوە
تۆ شایانی فرمێسکەکانی من نیت
دڵیشم بەرگەی ژانی ناوەختە ناگرێ

من دەڕۆم و ناگەڕێمەوە
چاوەڕوانی گەڕانەوەی من مەکە، تکایە.

تۆ عاشقێکی ترسنۆک بوویت
دەتویست من لەناو دێڕەکاندا، مانیفیستی
خۆشەویستیت بخوێنمەوە.
وشەکانت دەکردە مۆسیقای سەماکەرێکی بالێ
دەتویست وەک بینەرانی بەلشۆی تیاتر
لە جوڵەی ئەو سەماکەرە بگەم.

من دەمویست
تۆ بەدەنگی بەرز گۆرانی بۆ عەشق بڵێیت
من دەمویست
تۆ وەک ڕوونی کانیاو سپێتی بەفر
باسی تاسەی بینینی من بکەی.
تۆ عاشقیکی ترسنۆکی
منیش  سەرگەردانی عاشقێکی بوێرم
بەرەو ئاسمان بفڕێ و ئەستێرەکان لەکۆڵ بنێ.
بۆیە وا منیش جێت دەهێڵم
ئاڕاستەی هەنگاوەکانم دەگۆڕم.
دڵم بەرەو سەراب دەفڕێنم
ئەمجارەیان لە ئامێزی مردندا گەشکە دەمگرێ.
ببوورە ئازیزم
ماڵئاوا دڵم
هەر ئەم هۆنراوەیەش بوو، کۆمەڵێ پرسیاری لای خوێنەرانم دروستکرد.

پاش تێپەڕبوونی ئەم ماوەیە، کەسێک نەیتوانی بزانێ ئەم دیوانەم بۆ کێ نووسیوە. تەنیا شتێک بەلامەوە گرنگ بوو مێردە ئازیزەکەم ئەم دیوانەم نەکاتە ئیتاڵی. ئەوکات زۆر بریندارم دەکرد. تا ئێستا ئەم کارەی نەکردووە. ئەو بەردەوام وەک مۆمێک بۆ من دەسووتا، ئەو بیری لەوە نەدەکردووە سووتانەکەی بەرەو کۆتای دەبات. ئەو سووتانەی ئەو دڵی منی ڕووناک دەکردەوەو بەردەوام لەوە دەترسام گەر ئەم مۆمە تەواو بێت چی بکەم. دەیگوت ڕووناکی وزەیەکەو تەواو نابێت، من بەردەوام شەوت بۆ دەکەم بە ڕۆژ. من ڕۆیشتم و ئەو تەنیا لەگەڵ ئازارەکانیدا مایەوە. بڕیارم دا نەهێڵم بەتەنیا بمێنێتەوە. بەدوای ژنێکی گونجاودا دەگەڕام بۆی، لە ڕێگەی هاوڕێیەکی ئاسمانییەوە، ئەم ژنەم بۆ دۆزییەوە. لەو ساتەدا چوومە ناو جەستەیەوە، کاتێ ڕوانییە نیگاکانی بۆ جارێکی دی کەوتە خۆشەویستی چاوەکانیەوە. من جەستەی ئەو ژنەم داگیرکرد، تا وایان لێهات تێکەڵ بەیەک بوون. لەوە زیاتر نەمتوانی لەو جەستەیەدا بمێنمەوە. کە بەجێم هێشتن ئەوان ئیتر یەکترییان دۆزیبوویەوە. نەمدەویست ئەو دوای من تەنیا بێت، ئەو ژنەش باشترین کەس بوو بۆ ئەو. لەوانەیە بپرسی چۆن ئەم کارەم ڕێکخست. ئەو ڕۆژە ئەو ژنە دەبووایە بڕۆیشتایە بۆ شارێکی تر بۆ دۆزینەوەی کار. شەمەندەفەرەکەیم دواخست، چووە هەمان ئەو قاوەخانەیەی ئەوی تێدا بوو، چاویان بەیەک کەوت، ئەو لە جەستەی ئەو ژنەدا نیگای چاوی منی دۆزییەوە. بۆیە وا خێرا عاشقی بوو. خۆشی زۆر جار سەیری وێنەکەی من دەکات و دەڵێت»ئازیزم هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم پاش تۆ کەسێکی ترم خۆش بوێ، بڵێی ئەمە کاری خۆت نەبێت، منت بە جەستە جێ هێشت بەڵام ڕۆحت لەگەڵمدایە. تەنیا یەک نهێنی هەیە دەمەوێ بیزانم، چی وای لێ کردی ئەو بڕیارە بدەیت و کۆتایی بە ژیانت بهێنی. نە هیچ کەسێک و نەهیچ خۆشەویستییەک

شایانی ئەوە نین تۆ ژیانتی پێبەخشی. من دڵنیام لەوەی تۆ خۆت بە بڕیاری خۆت کۆتاییت بە ژیانت هێنا. هەرچەندە ئەم نهێنییە هەر لای خۆم دەمێنێتەوە. مەگەر بێمە لات ئەو کات ناچارت دەکەم ئەو نهێنییەم بۆ ئاشکرا بکەیت. هەموو شەوێ کە خەو دەمباتەوە ئاوات دەخوازم بۆ سبەینێ لای تۆ بم. »
دەزانم ئەوانەی خۆشەویستی لە دەروونیاندا لەدایکدەبێت، تیشکی هەتاو دەبێتە بەرگی جەستەیان، دڵی ئەو جەستانە وەک کانیاوی دامێن چیاکان پاکن و هەرگیز ئازاری ئەو خاکە نادەن، کە بەسەریدا جۆگە هەڵدەبەستن. ژیان لای ئەوان هەموو ڕەنگەکان داگیردەکات. وشەکانیان ئامێزی گەرمی هەمووانەو پێکەنین بەرگی چاویانە. ڕق و کینە توخنی تەنیا ئەو کەسانە دەکەون کە خۆشەویستی لە دەروونیاندا لەدایک نەبووە. لەوانەیە هەر ئەمەش بێت ئەوانەی خۆشیانویستین نەیانویست ئازاری ئەوانە بدەن کە زەمانێکە لەگەڵیاندا دەژیێتن.

لەمەدا لەگەڵتا نیم. ئەی ئەوە نییە ئەوان ئازاری ئێمەیان دا. تەماشا کاتێ خۆشەویستی ئیگۆر داگیری کردم، هەموو ژیانی گۆڕیم. نەگەیشتن بەو لووتکەیە، ڕووناکی لە ژیانم زەوت کرد. تۆ وازت لە خۆشەویستەکەت هێناو ئەم هەموو ساڵە لەگەڵ ئازاردا دەژیێت. ئەوان گەڕانەوە لای ژنەکانی خۆیان و هەناوی ئێمە وەک داری پایز بێ گەڵا مایەوە.

ئاخر ئێمە نەبووینە سەرچاوەی ئازاری کەسانی تر. ئەو خۆشەویستییەی لە دەروونماندا لەدایکبوو ، ڕێگەی نەداین ببینە سەرچاوەی ئازار بۆ کەسانی تر. ئێمە خۆمان فیدای خۆشەویستی خۆشەویستەکانمان کرد. خۆفیداکردنیش سنووری خۆشەویستی دەبەزێنێ. ئازیزەکەم هێشتا لەمە نەگەیشتووی. کە گەڕایتەوە دەبێ بەوردی لە هەستەکانی خۆت

ورد ببیتەوە. دەبێت خۆت یەکلا بکەیتەوە. گەڕانەوە بۆ هانس یان دەست پێ کردنی ژیانێکی نوێ لەگەڵ نەورۆزدا. تەماشای نەورۆز بکە، پاش ئەم هەموو ساڵە، خۆشەویستی بۆ تۆ بەردەوام پتەو دەبێت. هەرگیز هیوا نابڕێ لەوەی شەوێک دێت لە ئامێزی تۆدا خەو بیباتەوە. ئەو بەردەوام لەگەڵ تۆدایە، تەنانەت هەناسەدانەکەشی لەگەڵ هەناسەی تۆدا جووتە. ئەو زۆر پەشیمانە لەوەی ئەو کاتەی لەکۆلێژبوون ئەو ئازایەتییەی لەخۆیدا شک نەبرد دڵی خۆی بکاتەوە وخۆشەویستی خۆی بدرکێنێ.

ـ دەڵێی چی من دەگەڕێمەوە؟ لەلایەکەوە حەز بە گەڕانەوە دەکەم و لەلایەکی ترەوە حەزم لەم ئارامییەیە کە ئێستا تێدا دەژییتم.

ـ نا دەگەڕێتەوە، هێشتا کاتت ماوە، هێشتا زۆر لەو شتانەی لە پێناویدا هاتیتە ژیان تەواوت نەکردووە. شاراش بەم زوانە دێتە لات، سەمیرەش چاوەڕوانی هەلێک دەکات بێت بۆ لات.

ـ ئاخر هێشتا بڕیاری ئەوەم نەداوە چی بکەم گەر گەڕامەوە. گەڕانەوە بۆ هانس یان ئەوەی ماومە لە ژیاندا لەگەڵ نەورۆزدا بەسەری ببەم. دڵم سەرگەردانەو ڕێگای خۆی نادۆزێتەوە. هەربۆیە نامەوێ بگەڕێمەوە. شەرمەزاری شارام، ئەو هەموو ماوەیە نەمتوانی کچەکەی بدۆزمەوە، لەگەڵ ئەو هەموو هەڕەشەیەی لە سارام کرد. کەچی نەیتوانی دەریام بۆ بدۆزێتەوە.

ـ ئێستا ئەو لای ئاڤێستایە ، ئاڤێستا هاوڕیی نزیکی ڕێزانە. هەموو یەکتر دەدۆزنەوە خەمت نەبێت. ئێستا دەمەوێ سەمیرەت پێبناسێنم. ئەو دەبووایە بهاتایە بۆ ئێرە، کوڕەکەی گیروگرفتی هەیە و نازانێ چۆن یارمەتی بدات، هیوای بەوەیە تۆ گەڕایتەوە پەیوەندی پێوە بکەیت و یارمەتی بدەیت.

لەچاوتروکانێکدا سەمیرە لە بەردەمدا قیت بوویەوە. سەمیرە ژنێکی بالابەرزی خوێن شیرینە. سەمیرە لە گەنجێتیدا کورێکی هاوتەمەنی خۆی خۆش ویست، خۆشەویستییەکی بێ کۆتایی. خێزانەکەی رازی نابن شوو بەو کورە بکات. ئالەو کاتەدا باوکی پیاوێکی بۆ دەدۆزێتەوە، زۆری لێدەکەن شوو بەو پیاوە بکات کە هەرگیز نەیبینیوە. شووی پێدەکات و بیروهۆشی تەنیا لەگەڵ خۆشەویستەکەیدایە. لە رۆژی بوکینیدا جیا لە زۆربەی بووکەکان فرمێسک هەڵدەرێژێ. هەر لەیەکم شەوی بووکێنی رقی لە ژیان دەبێتەوە، رقی لە خێزانەکەی دەبێتەوە، رقی لە دابونەرێت دەبێتەوە کە مافی خۆشەویستییان لەو زەوت کرد. لە وڵاتەکەی ئەودا پاش تێپەربوونی دە رۆژ بەسەر یەکەم شەوی بوکێنی دا بووکێ و هەموو هاورێ کچەکانی دەچنە حەمام و ئاهەنگ دەگێرن. ئا لەو رۆژەدا یەکێ لە هاورێکانی ژووانێ بۆ ئەو و خۆشەویستەکەی رێکدەخات. ئەو رۆژە ماوەی چەند سەعاتێ پێکەوە بوون. شەوی یەکەمی بووکینی چاوەکانی نوقاند و لەهۆشی خۆیدا وتی ئەمەی لەگەڵمدایە ئەو کەسەیە کە چەند ساڵیکە خۆشمدەوێت. ئەو دە شەوەی بەو جۆرە بردە سەر. کەچی ئەو رۆژە پەردەی خەیاڵی شرِوشیتاڵ بوو. پاش ئەو رۆژە زانی ماچی خۆشەویستەکەی تامێکی تری هەیە، بۆنی هەناسەکەی بۆنی گوڵەمێخەکی لێدێت، گەرمی جەستەی لە گەرمی تیشکی رۆژ دەچێت. لەو رۆژەوە نەیتوانی چاوەکانی بنوقێنێ و بە خەیاڵی خۆشەویستەکەیەوە لە ئامێزی مێردەکەیدا بخەوێ. لەو رۆژەوە شەرێکی بەردەوامی شەوان دەستی پێکرد. لەهەموو شەوێکدا هەر ئەو دەیبردەوە. هەر ئەو پارچە بە پارچەی جلەکانی لەبەردادەکەند و بە زۆر جەستەی دەخستە ژێر جەستەی خۆیەوە. تێکشکان لەدوای تێکشان جەستەی سەمیرەی کردە ئەو گۆرەپانەی کە بەردەوام شەرەکانی تێدا دەدۆراند. دەروونیشی وەک دارێکی بێ ئاو رۆژ لە دوای رۆژ گەڵاکانی زەردهەڵدەگەران و

دەکەوتن. خۆی لێبوو بە سفر، بوو بە ئامێرێک کە بەکونترۆڵی ئەو بجوڵێتەوە. ساڵ تێپەڕی، بووە خاوەنی سێ منداڵ. زۆری پێکرد، دەیان جار لەبەردەم منداڵەکانیدا دارکاریی دەکرد. ئازاری زۆری چەشت، بە ئاشکرا لەگەڵ ژنانی تردا بوو، هەر بێدەنگ بوو. خۆشی نازانێ چۆن ڕۆژێک خەبەری بوویەوە، بڕیاری دا منداڵەکان ببات و ماڵەکەی بۆ بەجێ بهێڵێ. ئیتر لەو ڕۆژەوە ژیانێکی نوێی پڕ مەینەتی و ڕاکە ڕاکە دەست پێ کرد. ئەرکی سێ منداڵ کارێکی هێندە ئاسان نەبوو. لەجیاتی کارێ دوو کاری دەکرد. بەیانی تا پاش نیوەڕۆ کاری دەکرد. منداڵەکانی دەهێنایەوە لە قوتابخانەو خەریکی ئەوان بوو. کاتێ منداڵەکانی دەخەواند لە نیوەی شەودا دیسانەوە دەچوو کارێکی شەوانی دەکرد تا دەمەو بەیانی. ئەمە پیشەی ئەم ژنەبوو. تا چەند ساڵێ. باوکەش بەهیچ جۆرێ لە منداڵەکانی نەدەپرسییەوە. ماندووبوون و تەقەلادان شوێنی تروسکەیەکی لە ژیانیدا نەهێشتەوە. چەند جارێ هەوڵی خۆکوشتنی دا، لەهیچ یەکێ لە هەوڵەکانیدا سەرکەوتوو نەبوو، ئەوەش چارەنووسی خۆی بوو. منداڵەکانی گەورەکرد، ژیانێکی ئاسوودەی بۆیان مسۆگەرکرد. خانووی کڕی. منداڵەکان سەرکەوتووبوون لە خوێندندا. وردە وردە هۆش و ڕەنگووبۆی هاتەوە سەرخۆی. فێری لێخوڕینی سەیارە بوو، ئوتۆمبێلێکی کڕی. ئەم ژنە سیانزە ساڵ لە هەوڵدان و ململانێدا بوو لەگەڵ خودی ژیاندا. کاتێ خۆی گرتەوەو بڕیاری دا دەست بە ژیانێکی نوێ بکاتەوە، مێردە کۆنەکەی ئەمەی پێ ستەمبوو، بۆیە ئەم پلانەی بۆ دانا. سەیر ئەوەیە ئەم منداڵانە منداڵی ئەون، چۆن توانی بێ دایکیان بکات. دوانییان لە سەرووی هەژدەوەن. بەڵام کچەکەی تەنیا شانزە ساڵە.

ئێوارەیەک دەگەڕایەوە ماڵەوە لە پێش دەرگاکەی ماڵەکەیاندا، گوللەیەکی

بەرکەوت. نەمرد، بەڵام بۆ ماوەیەک کەوتە کۆماوە. منداڵەکانی بەردەوام سەردانیان دەکرد. لە ساتێکدا بڕیاری دا کە ڕۆحی بە یەکجارەکی جەستەی جێ بهێڵێ. دڵی لە لێدان کەوت و هەناسەکانی خنکان. تائێستاش کەس نازانێ کێ تەقەی لێی کرد. لەگەڵ ئەوەی من دەزانم ئەو کەسە کێبوو. مێردەکەی کوڕێکی برادەری بە ناوی مەحمودەوە ناردە سەری تا تەقەی لێبکات. ئەو دەمانچەیەشی کە تەقەی پێکرد بە دزییەوە لە فەرەنساوە هێناویانە. کارەکەی هێندە بەڕێکوپێکی کرد، دۆزینەوەی مەحاڵە. ئەو یەکێکە لەو ژنە ئازایانەی لەگەڵ هەموو دەردەسەری و سەختیەکدا لەسەرپێی خۆی ڕاوەستا. ئەو پیاوانە وەک مێردەزمەی ژنەکانیان وان. بەردەوام سەرچاوەی هێزو وزەیان وشکدەکەن. پاش جیابوونەوەیان لەو پیاوانە هەست دەکەن ژیانی هاوبەش لەگەڵیاندا، چەند تواناو وزەیان لێبڕیون. پاش ئەوەی لەسەرپێی خۆیان دەوەستن هەست بەو وزە شاراوەیەی خۆیان دەکەن وکاتێ سەرچاوەی وزەکەیان دۆزییەوە، داهێنان بە جۆرە جیاوازەکانەوە لە ژیانیاندا وەک گوڵاڵە سوورە لە باخچەی ژیانیاندا دەپشکوێ. ئەو ژنانەی بەم قۆناغەی ژیاندا تێدەپەڕن، ئیتر ئەوانە نە لەم ژیانەو نە لەژیانێکی تردا هیچ زوڵمێکی پیاو قبووڵ ناکەن، هەر ئەمانەشن ڕێچکەی یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە دادەنێن. چەند ئەم ژنانە زۆربن هێندەش ئەو یەکسانییە لەناوکۆمەڵگادا خێرا تر دەچەسپێ.

- 6 -

ترسێک له دەروونی هەردووکیاندا بەدی دەکرا، هەردووکیان نەیاندەوێرا توخنی ئەو سنوورە بکەونەوە کە هەریەکەیان بۆ خۆیانیان دانابوو. ڕۆژانە لە قسەی ئاسایی زیاتر باسی شتێکی تر نەدەکرا. ئاڤێستا گورج دەریای گواستەوە بۆ قوتابخانەی ناوچەکە. دەریا هەموو شەوێک دەپاڕایەوە و هانای بۆ دایکی دەبرد یارمەتی بدات و لەمە زیاتر ئەملاو ئەو لا نەکات. لەوە زیاتر توانای ئەوەی نەماوە بچێتە هەر ماڵێک و هەوڵبدات خۆی لەگەڵ خەڵکانی ئەو ماڵەدا بگونجێنێ. ئازار و خەمەکانی خۆی بشارێتەوە. ئەو بارەی دەریا هەڵیگرتبوو زۆر گەورەتر بوو لە تواناکانی خۆی. چاوەکانی دەنووقاند دەپاڕایەوە لە دایکی»دایە گیان! دایە گیان تکایە گوێم بۆ بگرە، من لەوە زیاتر ناتوانم بەو جۆرەی ژیاوم بژیم، دایە گیان ناتوانم تکایە یارمەتیم بدە ئەمە دوا ماڵم بێت. هەندێ جار هەناسەکانم کورت دەبنەوە و ترپەی دڵم هێواش دەبێتەوەو ئاواتە خوازم لەوە زیاتر نەژیم بۆ لای تۆ بێم. گەر تۆ دەتزانی وا زوو دەڕۆیت بۆ منت هێنایە ئەم دنیایەوە دایە گیان. دەزانم ئەم کچە زۆر باشە کەچی هەر دەترسم.»دەریا لەسەر جێگەکەی پاڵکەوت و هێندەی نەبرد هەستی بە شنەی بایەکی فێنک کرد، هەموو ماسولکەکانی گیانی خاوبوونەوە. هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و هەستی بەبوونی دایکی کرد. هێمن بوویەوە. هەر لە منداڵییەوە دەیزانی ئەو شنە فێنکە نیشانەی بوونی دایکییەتی لە تەنیشتیەوە. ئەو شنەیە لەسەختترین ساتەکانی ژیانیدا بە هانایەوە دێت و وەک دەستێکی فریشتەیی بەرەو ئاسمان بەرزی دەکاتەوە. دەریا دڵی خۆشبوو، بڕیاریدا کاربکات بۆ گەڕانەوەی تواناکانی. زۆر مەبەستی بوو هەتاو و ڕێزان بدۆزێتەوە. هێشتا نەیدەزانی ئاڤێستا هاوڕێیەکی نزیکی ڕێزانە.

دەریا دڵی زۆر بە ژوورەکەی خۆی خۆشبوو. لەگەڵ ئەوەی

منداڵبوو، هەوڵی دەدا ژوورەکەی پاک ڕابگرێ و یارمەتی ئاڤێستا بدات. ئێوارەیەکی ڕۆژی شەممە بوو، ئاڤێستا خواردنی ئامادەکرد و بە دەریای وت کە هاوڕێیەکی ئازیزی دێت بۆ لای. ئەودووانەیەکی هەیە، کوڕێک و کچێک. ئەوانیش لە تەمەنی ئەمدان. چووە ژوورەکەی خۆی و کتێبەکەی گرت بەدەستییەوە. بۆ ئەم کتێب بەدەستەوە گرتن مانای خوێندنەوەی کتێبەکە نییە، بەڵکو مانای کەوتنە ناو قووڵایی بیرکردنەوە. ئەو هەر خۆی ئەو فێڵەی دەزانی. بێدەنگی و هێمنی دەریا تا ڕادەیەکی زۆر ئاڤێستای نیگەران کردبوو و هەروا دیوارێکی لە نێوانیاندا دروستدەکرد. نەشیدەزانی چۆن و کەی ئەو سنوورە بشکێنێ. ئەو زۆر حەزی دەکرد هەر زوو ئەو دیوارە بڕوخێنێ و ببێتە ئەو هاودەمەی پێویستی پێی بوو. دەریا لە دەرکەوتنی هەر کەسێکی نوێ لە ژیانیدا دەترسا. دەبووایە هەوڵدا خۆی بگونجێنێ لەگەڵ هەموو ئەو کەسە تازانەی دێنە ژیانییەوە. ئەمەش وای دەکرد زیاتر و زیاتر لە خودی خۆی دووربکەوێتەوە. هاتنی ئەم سێ کەسە ئەو ڕۆژە ئۆقرەی لێبڕیوو هەر دەهات و دەچوو بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێت. زوو زووش دەچووە لای ئاڤێستاو دەیپرسی گەر یارمەتی بوێ. ئاڤێستاش لەو ڕووەوە زۆر تایبەتی بوو، کە کارێکی دەکرد نەیدەویست کەس لە تەنیشتییەوە بێت. خۆی لە موتبەخەکە دەوەستاو گۆرانیەکانی عەلی مەردانی دەخستە سەر و ئاگای لەخۆی نەدەما. باوکی زۆر حەزی لە گۆرانییەکانی عەلی مەردان بوو. ئەمیش هەر بەیادی باوکییەوە هەر کاتی هەبێت گوێ لە گۆرانییەکانی ئەو دەگرێ.

ڕێزان و خەندە و سەرکەوت هاتن. دەریا یەکسەر ناسینیەوە، ڕیزان بگرە لە جارانیش جوانترە. منداڵەکانیشی گەورەبوون. بینینی ئەمان هەستێکی شێواوی لای دەریا دروستکرد. لەلایەکەوە دایکی و ئەو

ڕۆژانــەی خستەوە یـادی کە پێکەوە دەژییتان و لەلایەکی ترەوە دەیزانی لەڕێگەی ڕێزانەوە دەتوانێ هەتاو بدۆزێتەوەو پلانەکانی خۆی جێبەجێبکات. ڕێزان دەریای بینی، هەڵوێستەیەکی کردو فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە. باوەشی بە دەریادا کرد و وتی ببورە دەریا گیان. هاوڕێیەکی خۆشەویستم هەبوو، کچێکی هەبوو ناوی دەریا بوو، کە تۆم بینی ئەوم بیرکەوتەوە. دەریای ویستی بڵێ ئێ من هەر ئەوم. نەیزانی بۆ خێرا قسەکە لە دەمیەوە نەهاتە دەرەوە. دەریا لەگەڵ خەندە و سەرکەوت چوونە ژوورەکەی خۆی. لەوێ یارییان دەکرد. دەریا هەستی دەکرد ئەو لەوان زۆرگەورەترە و زۆر بە زەحمەت دەتوانێ ئەو یارییانە بکات کە ئەوان حەزیان لێیەتی. لە قوتابخانە و باخچەی ساوایان هەمان گرفتی هەبوو. بـەردەوام خۆی بەتەنیا دەبینییەوە. نەیدەتوانی یاری لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنی خۆیدا بکات. ئەو کاتەی لە باخچەی ساوایان بوو پەنای دەبردە ئەو ژنەی لە موتبەخ کاری دەکرد و لەگەڵیدا ڕازی قسەی دادەمەزراند. لە زۆربەی باخچەی ساوایاندا ئەو ژنانەی بەتەمەن بوون لەگەڵیدا حەزیان بە دەمەتەقێ دەکرد. ئا بەو جۆرە خۆی لە یاریکردن لەگەڵ منداڵەکاندا ڕزگاردەکرد. بەڵام کاتێ گەورەبوو و دەستی بە قوتابخانە کرد، هەلێکی وا لەبەر دەستیدا نەبوو، بۆیە ئەو دوو ساڵە بۆ ئەو گەلێ گرانبوو. زۆر جار مامۆستایانی نیگەران دەبوون لەوەی ئەم بەردەوام بەتەنیایە. دەیانبردە لای دکتۆری دەروونـی قوتابخانە. پاشان ئەو دەیگوت هۆکەی ئەوەیە ئەم منداڵە ژیانێکی ئاسایی نەبووەو منداڵێتی خۆی نەژیاوە. ئەمە ڕاست بوو بەڵام ئەوان ئەو نهێنییەیان نەدەزانی کە دەریا وەک ڕۆحێکی کەسێکی گەورە هاتووەتە ئەم دنیایەوە. ئەو نهێنییە تەنیا خۆی و هەتاو دەیانزانی.

لە یاریکردن لەگەڵ ئەو منداڵانەی هاوتەمەنی بێزاربوو. بۆیە هەرجارەی

به بیانوی شتێکەوه دەچووه هۆڵەکه تا بزانێ ئەوان باسی چی دەکەن. ڕێـزان داوای له ئاڤێستا کرد زانـیاری زیاتر لەسەر دەریـا بزانێ باشتره. ئەو هەستێکی لا دروستبووه ئەمه دەریای هاوڕێکەیەتی. ئەو ئێوارەیه باسی شارا زۆرکراو. بەڵام ناویان نەدەهێنا. ڕێزان برینەکانی هەموو کولانەوه. ئەو سێ ژنه زۆر لەیەکەوه نزیکبوون، کەچی له چاوتروکانێکدا هەرسێکیان تەسلیمی چارەنووسی خۆیان بوون. ڕێزان پاش جیابوونەوه لەوان، ژیانێکی نوێی دەست پێکرد. کاری دۆزییەوەو خانووی وەرگرت. ئەو پیاوەشی له کوردستان شووی پێکردو هێنای بۆ سوێد، تەنیا شەش مانگ لەگەڵیدا ژیا. هـەروەک خۆی دەڵێ ئەو عاقڵییەی کرد که نەیهێشت منداڵی لێ ببێت. نەک ئەوەش نەیهێشت ئیقامه وەرگرێ، پاش جیابوونەوه ناردیەوه بۆ کوردستان. ئەو پیاوه لەگەڵ منداڵەکانیدا هەڵسوکەوتی باش نەبوو، لەهەمان کاتدا دەیویست هەموو جوڵانەوەیەکی ڕێـزان کۆنترۆڵ بکات. کەسایەتی ڕێزانیش ڕێگەی بەهیچ کەسێک نەدەدا کۆنترۆلی بکات و توندوتیژی لەگەڵدا بەکاربهێنێ. کەم ژن هەیه وەک ڕێزان بیربکەنەوه. ڕاسته ماوەیەک فەلاقه و ئازاروسووکایەتیپێکردنی له مێرده کۆنەکەی قبووڵ کرد. بەڵام هێنده درێژەی نەکێشا و هەر زوو له ڕێگەی جیابوونەوەوه سنووری بۆ ئەو توندوتیژییه دانا. لەگەڵ ئەم مێرده تازەیەی بگرەو بەردەی زۆری کرد و ویستی هەندێ بۆچوون و تێڕاوانینی بۆ ژیان بگۆڕێ. بەڵام کەڵکی نەبوو. دەرچوو ئەم جگه له دوواکەوتووی بیرکردنەوەی گرفتێکی تریشی هەبوو که ڕێـزان خۆی له باس کردنی لادەدا. تا ئێستاش ڕێزان نایەوێ من ئەو نهێنییەتان بۆ باسبکەم. با بزانین کەی خۆی باسیدەکات. بەڵام ئەم بەسەرهاته وای له ڕێزان کرد بڕیاری کۆتایی بدات. هەردووکیان دەچوون زمانی سوێدییان دەخوێند، هەر یەکه ئاستێکیان دەخوێند. ڕۆژێک گرۆپەکەی ڕێزان چوون سەردانی

شانۆی ئۆپێرا بکەن. پاش نیوەڕۆ گەڕانەوە بۆ قوتابخانە. دیاربوو کاکم بەرێکەوت لەگەڵ قوتابیەکانی پۆلەکەیدا ئەوی نەبینیبوو ، بۆیە گومان لە دڵیدا دروستبوو کە ڕێزان بەلایەکی کەدا چووە. ڕێزان پاش قوتابخانە منداڵەکانی لە باخچەی ساوایان هێنایەوە. هەر دەرگای کردەوە کابرا بە چەقۆیەکەوە چاوەڕوانی دەکرد. هەر کە هاتە ژوورەوە بێ ئەوەی بیر لەو دوو منداڵە بکاتەوە، چەقۆکەی خستە سەر سنگی و هاواری کرد»پێم بڵێ ئەمڕۆ لەگەڵ کێدا بووی، وا دەزانی دەتوانی درۆم لەگەڵدابکەیت.. دەی بڵێ ئەمڕۆ کێ.... ... دەی بڵێ ئەمڕۆ کێ....، ...» ڕێزان حەپەساو هاواری کرد»سەرلەدەمەو بەیانی لە شانۆ بووین، پاشانیش هاتینەوە بۆ مەکتەب. من تۆم بینی لەگەڵ چەند پیاوێکی سۆماڵی دانیشتبووی. سبەی لە مامۆستاو قوتابییەکان بپرسە. دوێنێ من لە کوێ بووم». منداڵەکان دەگریان و دەوری دایکیان گرتبوو. ڕێزان سەیری منداڵەکانی کرد، دەگریان و ترسێکی بێ سنوور لە نیگاکانیاندا دەبینرا. ڕێزان بە هەموو هێزی هاواری کرد بە سەریداو چەقۆکەی لێ وەرگرت و وتی «بۆ تۆ بەلاتەوە گرنگە من لەگەڵ پیاوێکی کە ببینی، خۆت پیاوەکەت دەوێ». منداڵەکانی بردە ژووری نووستنەکە و دەرگاکەی داخست و منداڵەکانی لە ئامێزگرت و هەرسێکیان پێکەوە تێر گریان. هەرسێکیان بەبێ ئەوەی نانی ئێوارە بخۆن و دانیان بشۆن و جلی خەو لەبەربکەن خەویان لێکەوت. بۆ سبەینێ منداڵەکانی هەڵگرت و پەنای بردە بەر ماڵی ژنان و بێ هیچ دوو دڵییەک هەمان ڕۆژ داوای جیابوونەوەی کردو پاش مانگێ کابرایان ناردەوە بۆ کوردستان. پاش ئەو جارە ڕێزان نزیکی هیچ پیاوێک ناکەوێتەوە و بڕیاری داوە ژیانی بۆ خۆیی و منداڵەکانی تەرخان بکات. لەو کاتەی ئەو بڕیارەی داوە، ژیانی زۆر ئاسوودەیەو خوێندنی تەواوکرد و وەک مامۆستا کاردەکات و منداڵەکانی زۆر زیرەکن. تەنیا ئەوەی تۆزێ بێزاری دەکات لەم دوو ساڵەی دواییدا

باوکیان له ڕێگەی دادگاوه داوای بینینی منداڵەکانی کرد و هەفتە نا هەفتەیەک دەیانبینێ. ترسی لەوه هەیە ئەمیش هەروەک هەموو ئەو ژنانەی تر ژیانی تەرخان بکات بۆ منداڵەکانی، کە گەورەش بن بەرەو لای باوکیان بڕۆن. زۆر لەو هاوکێشانەی له ژیاندا هەن، ئەنجامەکەی ناحەقییه بەرامبەر بەژنان. زۆربەی ئەو ژنانەی جیا دەبنەوه، هەموو ژیانیان بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانیان تەرخان دەکەن. پاش ئەو هەموو ڕەنج و قوربانییەی ژنان بۆ منداڵەکانیان دەیدەن، کەچی کاتێ کە گەورەدەبن، منداڵەکان ڕوو دەکەنه لای باوکیان و زۆریشیان بەتایبەتی کوڕەکان پشت له دایکیان هەڵدەکەن. ئەمه هاوکێشەی ژیانەو تا بڵێی نادادپەروەرانەیە. ئەمەش لەوانه بێت لەو تەمەنەی کە پێویستیان بە باوکیان هەبووبێت، باوک وجودی نەبووه له ژیانیاندا، بۆیه هەر کە ئەو هەلەیان بۆ دەرەخسێت خێرا دەیقۆزنەوه. بۆیه زۆربەی دایکەکان لەم هەڵوێستەی منداڵەکانیان زۆر بریندار دەبن. لەهەمان کاتدا نایانەوێ لەبەردەم حەزی منداڵەکانیاندا بووەستن. چیرۆکی ژنان پڕە له ئازار و ژان، زەمانێکی ئەوێ سەرچاوەی ئەو ئازارو ژانانه بنەبڕبکرێ. خودی ژنانیش بەتەنیا ناتوانن بنەماکانی نادادپەروەری کۆمەڵایەتی لەبنەوه هەڵکێشن .

لەم خاڵەدا ڕێزان و ئاڤێستا یەکیان دەگرتەوه. هەردووکیان بڕیارییان دابوو جارێکی تر نەیەڵن پیاوێک بێتە ژیانیانەوه و بەنزمی سەیرییان بکات و دەستیان لێبەرزبکاتەوه. ئەوان لەو ئافرەتانەن وەک ژنێکی ئازادو بڕوا بەخۆ دێنەوه ژیانی داهاتوویان. هەموو ئەو ڕووداوانەی له ژیانماندا ڕوودەدات، بە ڕووداوه ئازارئامێزەکانەوه هەنگاوێک دەمان باتە پێشەوه بۆ گەیشتن بە کامڵبوونی هۆشمان.

ئاڤێستا لەو بڕوایەدایە ناتوانێ لەگەڵ پیاوێکدا بژی. بۆیە بەنیاز نییە جارێکی تر پیاوی بهێنێتە ژیانییەوە. هەربۆیەش بڕیاری دا منداڵێکی کورد هەڵگرێتەوە. داواشی کرد ئەو منداڵە کچ بێت. هەر هیچ نەبێت کچێکی کورد وا پەروەردە بکات، زوڵمی پێ قبووڵ نەبێت، ئازادانە ئەو بڕیارانەی پەیوەندی بەژیانی خۆیەوە هەیە بیدات و نەیەڵێ هەر لە منداڵییەوە کۆتبەند بکرێ. ئەو هێشتا برینەکانی ساڕێژ نەبوونەتەوە، لەگەڵ ئەوەی لە سەرەتاوە بە یارمەتی میتۆدی دیانێتیک زۆر لە برینەکانی ژیانی ساڕێژکرد. کەچی نازانم شەرمی دەکرد یان نەیدەویست باسی ئەو پەیوەندییەی بکات و لەو زامە قوڵە نزیک بکەوێتەوە. چونکە توانای ئەوەی نییە ڕووبەڕووی ئەو مێردەزمەیە ببێتەوە. ئاڤێستا دەبێت ڕووبەڕووی ئەو ئازارانە ببێتەوە، بۆ ئەوەی باری ژیانی سووکتربێت و بتوانی هەنگاو بۆ داهاتوویەکی ڕووناکتر بنێت. لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵدانەی ڕێزان لەگەڵی دەدا، کەچی ناگاتە ئەو بڕوایەی کە دەبێت ئەو کۆڵەی بە سەر شانیەوە هەڵیگرتووە دایبنێت. ئەو بارە وەک بەردێک وایە لە ڕێگایدا بەرەو ئاسوودەیی و پێشکەوتن. ژیان لەگەڵ دەریادا ئارامیی پێبەخشیووەو لەهەمان کاتدا کاتێ شەوان دەچێتە ناو جێگە، ویژدانی ئازارێکی زۆری دەدا چونکە ئەو منداڵەی لەناوبرد. هەرچۆنی بوو ئەو بوونەوەرێکی زیندوو بوو. هەموو جارێ لە دڵی خۆیدا دەڵێت ڕۆڵە گوناهت بە ملی باوکت. خۆشی نەیدەویست هیچ شتێک بەو پیاوەوەی ببەستێتەوە کە هەڵیخەڵەتان و سووکایەتی پێکرد. جاری واش هەیە دەڵێ خۆزگە لەناوم نەبردایەو بەخێوم بکردایە بەبێ ئەوەی ئەو بیزانیایە. ئەو ئەمی نارده دەرەوەو هەڕەشەی لێی کرد گەر ئەو منداڵە لەناو نەباو بەڵێنەکەی خۆی بەدی نەهێنێ ئەوا جارێکی تر چاوی بەدایکی ناکەوێتەوە. ئەم هەڕەشەیە بەردەوام لە گوێیدا دەزرنگایەوە. ئەو کاتەش بیرکردنەوەی وەک ئێستا

نەبوو. جاران وەک کچێکی گێلۆکەی نەفام سەیری ژیانی دەکرد و گرفتەکانی ژیانی وەک ئێستا نەدەبینی. ئێستا هەموو بۆچوونەکانی گۆڕاون. تێکەڵبوون بە کولتوورو بۆچوونی نەتەوەیەکی تر یاریدەر و هاندەرێکی باشبوون تا بگاتە ئەم قەنەعاتانەی ئێستای.

ڕێزان زۆر کاری لەسەری خۆی کردووە. لە ئەنجامی دوو ئەزموونی سەرنەکەوتوو لەگەڵ دوو پیاوی کورددا، هەڵوێستی زۆر نێگەتیڤە بەرامبەر پیاوی کورد. بەردەوام دەیەوێت ئەو ڕقەی کە هەیەتی بەرامبەر پیاوی کورد کەمی بکاتەوە. چونکە هەر خۆی بوو ئەو پیاوانەی هەڵبژاردو هەر خۆشی بڕیاری دا شوویان پێبکات. ئامانجی شووکردنەکەی دۆزینەوەی خۆشەویستی و ئارامی نەبوو، بەڵکو هەردوو جارەکە مەبەستێکی تری هەبوو بۆیە لە هەردوو جارەکە شکستی هێنا. ڕێزان خۆشی بەو ڕاستییە گەیشتووەو لەناوەوەی خۆشیدا بەبێ دەنگی ڕەخنە لەخۆی دەگرێ. دەست پێ کردنی ژیانێکی نوێ لەگەڵ پیاوێکی دیدا وردبوونەوەی زۆری دەوێت، هەربۆیە ئێستا نایەوێ ئەو کاتە بدات بەم گەڕانە. هەوڵدەدا کاتی بۆ خۆپەروەردەکردن و دۆزینەوەی خۆی بەکاربهێنێ. خوا حەق بڵێ، زۆر هەنگاوی بەرەو پێشەوە ناوەو خاوەن بۆچوونی تایبەت و ئەزموونێکی زۆرە. هەربۆیە ئاڤێستا وەک ژنێکی نموونەیی تەماشای دەکات و تا دێت زیاتر لەگەڵیدا دەکرێتەوەو نهێنییەکانی ژیانی بۆ باسدەکات. هەرچەندە هەندێ نهێنی هەیە زۆر زەحمەتە بتوانێ بۆی باسبکات. حەز دەکات کات بۆ دواوە بگەڕێنێتەوە و پەیوەندی لەگەڵ یەکەمین پیاوی ژیانیدا بسڕێتەوە. تا ئێستاش لەو باوەڕەدایە ئەو یەکەمین و دوا پیاوی ژیانی دەبێت، نازانێ چارەنووس چ پلانێکی بۆ داناوە. ئەو پیاوە ئەو ساتانەی دەیویست دەیکردە شاژنی ژیانی، ساتێکی تر دەیکردە ژنێک کە یەکسان بوو بە

سفر. هەموو ئەو شتانەی پێدەکرد، کە ئەم لە فیلمیشدا نەیبینیووە. لەسەرەتاوە مژین و لێسانەوەی بەکارێکی قیزەوەن و نەشیاو دادەنا لە کاتێکدا ناچارکرا ئەوەش بکات. بە داخەوە لەوێدا نەوەستا، دەستەمۆی کرد. هەرجارەو فلیمێکی سێکسی دەهێناو پاش ئەوەی سەرخۆشی دەکرد  هەموو ئەو شتانەی پێدەکرد کە لە فلیمەکەدا نیشان دەدرا. هۆشی دەهاتەوە سەرخۆی وایدەزانی ئەوانە هەموو خەوێکی ناخۆش بووە و بەسەرچووە. ئەو خەوانە بەردەوام بوون. ڕۆژێک هەستی بە ئازارێکی زۆرکرد، هەستی کرد هەموو جەستەی لەناوەوە دراوەتە بەر خەنجەرێ و دڵی تێکەڵ دەهات و سەری گێژی دەخوارد. نەیدەتوانێ هیچ بخوات و دەرشایەوە. ئەو کاتە خەبری بوویەوە و بڕیاری دا سنوورێک بۆ ئەو خەوانە دابنێ. سنووری بۆ ئەو خەوانە دانا، پشتگوی خراو نەدەبینرا. ئاڤێستا دەیویست ئەو سات و ڕۆژانە لە یادو هۆشیدا بسڕێتەوە. هەر کاتێکیش ئەو ساتە بەئازارانەی دەکەوتە یاد، خێرا لەبیری خۆی لادەبرد. هەر کاتێکیش پیاوێک نزیک دەکەوتەوە لێی، خێرا ئەو دیمەنانە دەهاتەوە پێش چاوی و دووردەکەوتەوە. ئەو نەیدەوێرا نزیکی هیچ پیاوێک بکەوێتەوە، بەتایبەتی گەر کورد بووایە. بۆیە بەردەوام خۆی دوورەپەرێز دەگرت لە تێکەڵاوی کۆڕو کۆمەڵ. نەک ڕووبەڕووی پرسیارێک بێتەوە و دۆزینەوەی وەڵامی درۆینە زەحمەت بوو. خۆی لادەدا لە هەموو ئەو بابەتانەی بەرەو باس کردنی ژیانی تایبەتی دەبات، هەوڵی دەدا بابەتی باسەکە بگۆڕێ. هاورێ سوێدییەکانی بەم شتانەیان نەدەزانی، بە شێوەیەکی گشتی سوێدییەکان هێندە ناچنە بنجوبنەوانی شتەکان، گەر خۆت بۆیان باسنەکەی. ئەوان ئەو ئازایەتییەیان تێدا نییە، پرسیاری شتی تایبەتیت لێبکەن. بۆیە باشترین ڕێگا بۆ ئەم گەڕانەوەیە بۆ میتۆدی هیپنۆس بوو. خۆ دەتوانێ داوا بکات ئەمجارە ژنێک لەگەڵی دابنیشێ. دەزانێ باس کردنی ئەم شتانە بۆ پیاوێک زۆر زەحمەتە.

ئێستاش دەریا هاتووەتە ژیانییەوە بۆیە دەبێت خۆی لەو تراومانە ڕزگاربکات تا بتوانێ ئاسوودەتربێت.

ژیانی دەریا بەرەو باشی دەڕۆیشت و هەتا دەهات پەیوەندییان لەگەڵ ئاڤێستا قوڵتردەبوویەوە و لەیەکتر نزیک دەکەوتنەوە. دەریا خۆی بەتەنیا دەهاتەوە ماڵەوە. بەڵام بەیانیان ئاڤێستا خۆی دەیگەیاندە قوتابخانە. هەروا ڕێکەوتن کە لە قوتابخانە بڵێت ئەو دایکییەتی و لە باوکی جیابوونەتەوەو باوکی گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان. هەردووکیان دەیانزانی ئەمە درۆیەکی گەورەیە، ئامادەبوون ئەم درۆیە بکەن بەمەرجێ ژیانی دەریا لە قوتابخانە ئاسوودە بێت. بەڕێوەبەری قوتابخانەکە ئەم چیرۆکەی بەدڵ نەبوو، نەشیدەتوانی ئەم نهێنییە ئاشکرا بکات. دەریا کە دەهاتەوە دەستی بە ماڵەکەدا دەهێناو خواردنی بۆ خۆی گەرم دەکردەوەو پاشان دەیخوێندەوە. زۆر حەزی بە خوێندنەوەی ڕۆمان دەکرد. زۆرجار دەیانووت باش نییە ڕۆمانی گەورەساڵان دەخوێنێتەوە، ئەو ماوەیەی لای خێزانە سویدییەکە بوو، زۆر کەڵکی لە کتێبخانەکەیان وەردەگرت. ئیستاش ئاڤێستا هێندە ڕۆمانی نییە. زۆربەی کتێبەکانی لەسەر پەروەردەو زمان و هەندی بابەتن کە ئەم هێندە لێیان تێناگات.

ئەو ڕۆژەی تەلەفۆنێک کراو دەریا هەڵیگرت، گۆڕانکارییەک بەسەر ژیانی کۆمەڵە کەسێکدا ڕوویدا. ژیانەکان ئاڵۆزتربوون، فرمێسکەکان خوڕتر دەهاتنە خوارەوە. یادەوەرییەکان بە ژانێکی ترەوە لەدایکدەبوونەوە. دەریا ئەو ئازایەتییەی لە خۆیدا شکبرد و هەنگاوی یەکەمی نا، ئەو دەمێک بوو چاوەڕوانی ئەو کاتەی دەکرد. هەموو ئەو شتانەشی لە ژیانیدا ڕوویداوە، هەنگاو بە هەنگاو لەم مەبەستەی نزیکی کردەوە.
«ڕێزان من دەریام، ئەو ڕۆژە گوێم لە قسەکانت بوو دەتکرد بۆ ئاڤێستا.

ڕێزان من دەریام، کچی شارا». هەردووکیان لەبەرگریان نەیاندەتوانی قسە بکەن. دەریا هەرلەبەرەوە دەیگوت و دەیگوت «من دەریام کچی شارا، چەند چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەم دەکرد.»ڕێزان وشەکان لە دەمی نەدەهاتنە دەرەوە. هەرچەندی دەکرد نەیدەتوانی قسە بکات. «دەریا هەر ئێستا دێم بۆ لات.»

زۆر دەمێکە هەردووکیان ئەوەندە نەگریابوون. هەر کە سەیری یەکترییان دەکرد و دیسان دەستیان دەکردەوە بە گریان و یەکترییان لە ئامێز دەگرتەوە. «دەریا با هەردووکمان هێمن ببینەوە، جا هەموو شتێکم بۆ باس بکە. جارێ ڕاوەستە با بە دراوسێکەمان بڵێم منداڵەکانی منیش لەگەڵ کوڕەکەیدا بهێنێتەوە بۆ لای خۆیان.»
ڕێزان! دایکمیان کوشت، دایکم خۆیی نەکوشت، من دەمزانی، کاتێ دایەگەورە منی بردە دەرەوە، زانیم شتێکیان لەژێرسەردایە، بەڵام ئەو کاتە منداڵ بووم، هەرچەند هەوڵمدا تا نەڕۆینە دەرەوە، بەڵام هەر ناچاریان کردم. بەئەنقەست میزم کرد بە خۆمدا تا بگەڕێینەوە، کەچی کەڵکی نەبوو. دەستم کرد بە گریان و هاوارکردن. بیانووی دایکمم گرت. پەلکێشمی کرد. سواری پاسێکی کردم، بەدرێژایی ڕێگەکە دەگریام و هاوارم دەکرد. لە شوێنێکدا دایبەزاندم. چووینە پارکێکەوە. لە پەنایەکدا زۆری لێ دام. قسەی زۆری بە دایکم وت. دەمزانی ئیتر من بێت و دایکم نابینمەوە. ئەو ساتە ئاواتەخواز بووم گەورەتر بوومایە. پاش چەند سەعاتێ گەڕاینەوە ماڵەوە. دراوسێکان بە خەمەوە تەماشایان دەکردم. زانیم شتێ قەوماوە. دەرگامان کردەوە ڕۆحی دایکمم بینی بەو ناوەدا دەسووڕایەوە. هاوارم کرد: دایە دایە ئەوە چی دەکەی لێرە. خێرا دایەگەورەم بردمیە دەرەوە لای دراوسێکەیان دایانام. گوێم لێ بوو دایەگەورە کەوتە هاوارکردن و گریان. نەمدەزانی لە خۆشیدا

دەگرییێت یان بۆ خۆی دەگرییێت کە نەیتوانی کچەکەی ڕزگار بکات لەو دوو مێردە. ماڵە دراوسێکەمان عەرەب بوون، لە نێوانی خۆیاندا هەر چپەیان بوو. منیش هەر دەگریام و داوای دایکمم دەکرد. ئەو ماڵە لەگەڵمدا زۆر میهرەبان بوون. ژنەکە تا بەیانی بە دیارمەوە دانیشت. ئەویش نەخەوت و لەگەڵمدا دەگریا. بەیانی گەڕامەوە هەموو لەوێ بوون، دایکم دیار نەبوو. هاوارم کرد»کوا دایکم. چیتان لە دایکم کرد، ئێوە کوشتتان». ئەوان حەپەسان؛ ئەمەیان زۆر بە لاوە سەیر بوو، لەبەر ئەوەی هێشتا ئەوان گوێیان لەمن نەبووبوو وا قسە بکەم. پێم وتن «ڕاوەستن بۆم هەقی دایکمتان لێ دەکەمەوە. وازتان لێ ناهێنم». باوکم هەڵسا و بەر شەقی دام. هاواری کرد جنۆکە چووەتە گیانی منداڵەکەیشیەوە. هەموو دەمم پڕ بوو لە خوێن. شەوەکەی خەوم بە دایکمەوە بینی، زۆر بە دیارمەوە گریا و داوای لێ کردم بێدەنگ بم، خۆم هێمن بکەمەوە. ئەگینا شتێک لە من دەکەن. بەیانییەکەی هەڵیانگرتم و بردمیانە شارێکی تر. لە ماڵی خزمێکماندا مامەوە. ماوەی یەک مانگ لەو ماڵە و لە کونی ژوورەوەدا مامەوە. دەرەوەم نەدەدی. یەک وشە چییە لە دەمم نەهاتە دەرەوە. پاش ئەو مانگە گەڕامەوە لای دایەگەورە و بابە گەورەم. ئەو مانگە مێشکم هەر هەمووی بەوەوە خەریک بوو چۆن تۆڵەی دایکمیان لێ بکەمەوە. جارێکیان لە ژوورەکەی دایکمدا بووم، نەمزانی خەو بردمیەوە یان بە ڕاستی بینیم. پیاوێک لەگەڵ بابەگەورەمدا هاتنە ژوورەکەی دایکم. پاشان بابەگەورە ڕۆیشت و هەر ئەو مایەوە. ئەو کاتە دایکم خەوی لێ کەوتبوو. بینیم پیاوەکە بە پەنجەکانی پشتی ملی دایکمی گرت و دەستی بردە لای قورگی. وام زانی دەیخنکێنێ، بەڵام بێهۆشیی خست و پاشان گولۆپەکەی داگرت و دوو ڕەفتەی بەست بە یەکەوە، ئەوەندە بەخێرایی دەستی دەجوڵاند نەمزانی چیی کرد. ڕەفتەکەی کرد بە ملی دایکمەوە و بە

قولاپی گولۆپەکەدا هەڵیواسی. ئیتر ئا لەو ساتەدا خەبەرم بوویەوە و نەمبینی چی قەوما. وا بزانم دیمەنەکە هی ئەوە نەبوو کە من بیبینم. ئەو وێنانەی بینیمن مێشکم جێ ناهێڵن. ماوەیەک لای ئەوان مامەوە. دایەگەورەم بەردەوام خەمگین بوو؛ هەر دەگریا، بەڵام هیچ بەزەییم پێیدا نەدەهاتەوە. خۆیشم نازانم زۆر شتی سەیرم دەکرد. بە شەودا هەڵدەستام تەباخەکەم دادەگیرساند. شەویک خەریکبوو هەموو ماڵەکە بسووتێ. ڕۆژێک پێش ئەوەی بچین بۆ باخچەی ساوایان، بەبێ ئەوەی ئەوان ئاگایان لێ بێت، ئاوی حەمامەکەم بەردایەوە و کونی بانیۆکەم گرت. تا دایە گەورە هاتەوە هەموو ماڵەکە پڕ بووبوو لە ئاو. ئیتر هەر مەپرسە، ئەوەی لە ماوەی ساڵێکدا پێم کردن عەقڵ قبووڵی پێی نەدەشکا. پاشان منیان بردەوە لای باوکم. ئەو کاتە ژنێکی تری هێنابوو. هەر وەک جاران ئەوەی نەشێ بەو ژنەیشم کرد. شەوان نەدەخەوتم، پەنگی باشم دەدا. هەر چوار چاوەکەی وجاخەکەم دادەگیرساند و بە جێم دەهێشت و دەچووم بۆ خۆم دەخەوتم. یان کترییە کارەباییەکەم پێ دەکرد بەبێ ئەوەی ئاوێکی وەهای تێدا بێت. بە سەرمای زستاناندا پەنجەرەی مووبەقەکەم دەکردەوە. شوێنی شتەکانیم دەگۆڕی. گەر ڕێگەم بکەوتایێتە سەر پارەکەی دەرمدەهێنا و فڕێم دەدا. جارێکیان پێش سەفەرەکەی پەساپۆرتەکەیم دەرهێنا و فڕێم دایە کونی زبڵەکەوە. هەموو ئەم شتانەم دەکرد بەبێ ئەوەی بەڵگەیەک بدەم بە دەستەوە. شکیان خستبوو کە من ئەو کارانە دەکەم، بەڵام نەیاندەتوانی بیسەلمێنن. بەردەوام دەیانگوت شەیتان چووەتە بنکلێشەمەوە. ژنەکە زۆری لێ دەدام. کە لە باخچەی ساوایان بووم، بۆم باس کردن چۆن لە ماڵەوە لێم دەدەن. هەموو جارێ شوێنی لێدانەکەم نیشان دەدان. بۆیە پاش بەزموڕەزمێکی زۆر بڕیاریان دا من لای ئەوان نەژیم. ژنەکەی باوکم لە دادگا باسی ئەو شتانەی دەکرد کە من دەیکەم، کەس بڕوای

پێ نەدەکرد. بگرە بە نەخۆشیش لە قەڵەمیان دا. لەو ماوەیشەدا زۆر لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵم کرد. تا دواجار لای ئەندەش ولینا گیرسامەوە، ئەوان باش بوون لەگەڵمدا. کە کە (لینا) مرد، دایەگەورەم وتبووی ئەو جنۆکەیە قڕی خستە ئەو ماڵەیشەوە. ئەمە تەنیا کورتەکەیەتی. دوایی بە درێژی هەموویت بۆ باس دەکەم. زۆر حەز دەکەم هەتاو بدۆزمەوە. کە منداڵ بووم و هەموو پێکەوە دەژییتاین، هەر ئەو دەیزانی کە من ئەو توانایەم هەیە. تەنانەت دایکیشم ئەو ڕاستییەی نەدەزانی. لە هەمووی ناخۆشتر، تواناکانی منداڵیم نەماوە. ئێستا هیچ نابینم. هەستیش بە هیچ ناکەم وەک جاران. ماوەیەکە وەک دەرگا خۆمم داخستوە. کە ویستم دەرگاکە بکەمەوە کلیلهەڵگرەکەیم نەدۆزییەوە. تەنیا هەندێ جار دەتوانم پەیوەندی بە دایکمەوە بکەم. ڕووناکییەکەی دەبینم، وەک شنەیەکی فێنک بە ڕوومدا دێت. گوێم لە قسەکانی دەبێت. ڕێزان دەمەوێ لەیەک شتدا یارمەتیم بدەی. تا ئێستا نەچوومەتە سەر گۆڕەکەی دایکم و نایشزانم لە کوێیە. تکایە بەشکەم یارمەتیم بدەی بیدۆزینەوە. جارێ هیچ بۆ ئاڤێستا باس ناکەین.

دەریا گیان خەمت نەبێت، ئاڤێستا کچێکی زۆر باشە. ئەویش وەک ئێمە ناخۆشی زۆری دیوە. دەریا ئێستا، کە قسە لەگەڵ تۆدا دەکەم وا هەست دەکەم قسە لەگەڵ دایکتدا دەکەم. قسەکردن و بیرکردنەوەت هەروەک دایکت وایە. زۆر حەز دەکەم هەتاو بدۆزینەوە. ئا بزانە ناتوانیت شوێنی بدۆزیتەوە.

ماوەیەکی زۆر بیرم لەو دەکردەوە؛ لەم شەوانەدا جارێک خەوم پێوە بینی، بینیم لە نەخۆشخانەیەکدا کەوتووە، بەڵام نەمزانی چ شارێکە. دەزانی ئەو کە ڕۆیشت سکی هەبوو، دەبێت ئێستا منداڵەکەی ساڵێک لە من منداڵتر بێت. ئەوە ئاڤێستا هاتەوە دەبێت بێدەنگ ببین.

ئاڤێستا هاتەوە، لەو کاتەوە دەریا هاتووەتە لای دڵی بە ژیان زۆر خۆشە.

حەز دەکات زوو بگەڕێتەوە ماڵەوە و خەریکی خواردن لێنان بێت و پێکەوە نان بخۆن، جاران کە تەنیا بوو هێندە خواردنی ئامادە نەدەکرد. هاتنی دەریایش تا ڕادەیەکی زۆر ڕۆبەرتی بیر بردووەتەوە. دوو ساڵێک لەمەوبەر لەگەڵ یەکێ لە هاوکارەکانیدا دەستی بە یۆگە کرد. یۆگەکردن ئاڤێستای خستە جیهانێکی ترەوە. هەر لەوێ پەیوەندییەکی قووڵی لەگەڵ (مامۆستای یۆگە)کەیاندا پەیدا کرد. هەر لەگەڵ ئەویشدا چوونە چەند کۆرسێکەوە لە شوێنێکی (ئێنگلەگۆردن)ناودا کە دوو سەعاتێ لە ستۆکهۆڵمەوە دوور بوو. لەوێ فێر بوو چۆن دڵی بە خۆی خۆش بێت و نرخی خۆی بزانێ. لەوێ فێری میدیتەسۆن بوو. فێربوو چۆن بچێتە ناخی خۆیەوە و ئۆقرە بگرێت. هەتا دەهاتیش پەیوەندییەکەی لەگەڵ ڕۆبرتدا بەهێزتر دەبوو. هەرکاتێ ڕۆبرت هەنگاوێ دەهاتە پێشەوە ئەو دوو هەنگاو دەچووە دواوە. هەر لەوێ بوو ڕۆبرت وتی پێی، دەزانی من و تۆ گیانێکین لە دوو لەشدا؛ من و تۆ نیوەکەی یەکترین. زۆرجار چۆن ئەتۆم دەبێتە دوو کەرتەوە و هەر یەکە لەو کەرتانە هەمان وزەیـان هەیە. من و تۆش پێشتر ڕۆحێک بووین و بووین بە دوو کەرتەوە. ئێستا من و تۆ تەواوکەری یەکترین. یەکتریمان دۆزیوەتەوە و من ئامادەنیم لە دەستت بدەم. ئاڤێستا لە مەبەستەکەی نەگەییشت، ئەو جیهان و بۆچوونانە بۆ ئاڤێستا تازە و تا ڕادەیەکیش نامۆ بوون. ئەو جارانەی کە دەچوونە ئێنگلەگۆردن ماوەیەکی باشیان پێکەوە دەدایە سەر. لە ئامێزی سروشت و لەناو دارستاندا ئۆقرەیان دەگرت. باسی هەموو شتێکیان دەکرد. ئاڤێستا بەهیچ جۆرێ نەیدەویست باسی ڕابردوو بکات. ئێوارەیەک لە پیاسە دەهاتنەوە، سەتیام ئەو مامۆستای کۆرسەکانە، خەڵکێکی زۆر بەیارمەتیی ئەو و کۆرسەکانی، خۆیان و ئارامی دەروونـیـان دەدۆزیـیـەوە؛ ، پێی وتن «خەرمانەی ڕۆحی هەردووکتان دەبینم، تێکەڵ بەیەک بوونە، هەردووکتان پێکەوە یەک

پارچە ڕووناکین.»

ڕۆبرت لە مەبەستەکەی گەییشت، ئاڤێستا نە. ئەو ئێوارەیە ڕۆبرت و ئاڤێستا تا ماوەیەکی زۆر لە بەر تیشکی مانگ و لەپاڵ دارێکدا دانیشتن. بۆ یەکەمین جار لە ئامێزیی گرت، ئاڤێستا ویستی نەهێڵێت، بەڵام هێزێک لە ناخیەوە نەیهێشت. هەستی کرد هەموو ماسوولکەکانی گیانی خاو دەبنەوە، هەستی بە گەرمییەکی زۆر کرد. ڕۆبرت دەموچاوی ئاڤێستای خستە ناو هەردوو لەپیەوە چاوی بڕییە چاوەکانی و وتی «ئاڤێستا تۆم خۆش دەوێت، ئەو هەستە لە قووڵایی دڵمەوە هەڵدەقوڵێ. من یەکەمین جار تۆم بینی، هەستم بەو خۆشەویستییە پیرۆزەیەی تۆ کرد. بەڵام تۆ منت نەدەبینی. تۆ دەتویست لەو جیهانەی خۆت دەرچی کە سەرچاوەی ئازارەکانت بوو. من بەردەوام تۆم دەبینی، لە هەموو بزوتنەوەیەکی جەستەدا، لە هەموو هەناسەدانێکدا، لە ترپەی دڵتدا هەستم بەو ئازارانەی تۆ دەکرد. دەبینی بەهۆی ئەو خۆشەویستییەی منەوە گەیشتیتە ئەم ساتەی ئێستا. تکایە ئاڤێستا خۆشەویستەکەم دڵت بۆ ئەم خۆشەویستییەم بکەرەوە. خۆشەویستی نەک تەنیا گەرمی و ئارامیت پێ دەبەخشێ بەڵکوو وەک گوڵێکی بەهاران دەکرێتەوە و وەک با دەگەیتە ئەو شوێنەی کە دەتەوێ.»دەمی خستە ناو دەمیەوە، لێوەکانیی مژی، زمانی ئاڵاند لە زمانی. لەناکاوا ئاڤێستا وەک فیشەکە شێتە لە ئامێزی دەرچوو، تا توانای تێدابوو ڕایکردە ژوورەکەی خۆیەوە. خێرا پارچە بە پارچەی جلەکانی داکەند و خۆیی فڕێ دایە ناو جێگەکەیەوە و بە کوڵ گریا. هەوڵی دەدا بە دەنگ بەرز نەگرییێت نەکا کەسێکی تر گوێی لە گریانەکەی بێت. هەرچەندە لەو شوێنە خەڵک هەستیان بە ئازادییەکی زۆر دەکرد لە دەربڕینی هەستەکانیاندا. گریانەکەی ڕانەدەوەستا. بێزی لە خۆی دەهاتەوە، چۆن ڕێگەی بە خۆی دا جارێکی تر پیاوێک دەستی

لێ بدات و دەم بخاتە ناو دەمیەوە؛ هێڵنجی دەهـات، دەیویست بە ئاوی زەریاکان دەمی بشوات، خۆی بشوات با پاک ببێتەوە. ئەوەندە جەستەیی بە پیس دەزانی، بێزی لێی دەکردەوە. بیری دەهاتەوە چۆن ئەو، سمێڵە زبرەکەی دەخستە ناو دەمیەوە، دەیویست سمێڵی بمژێ. چۆن داوای لێ دەکرد بە زمانی سەرتاپای جەستەی بلێسێتەوە. ئەو شەوەی بیرکەوتەوە چۆن ڕشایەوە ئەویش لەقەیەکی لێی دا و ماڵەکەی بە جێ هێشت و وتی پێش ئەوەی بڕۆی ماڵەکە پاک بکەرەوە. لەناکاوا ڕشایەوە و ویستی هەڵسێ خۆی بگەیێنێتە حەمامەکەوە. بینیی هیچی لەبەردا نییە، کەوتە سەر زەوییەکە. ئەو لەو کاتەدا ئەو ژنەی کە لە تەنیشتی ژوورەکەیەوە بوو، هەستی کرد شتێکی نائاسایی دەقەومێت. بۆیە دای لە دەرگاکە و هاتە ژوورەوە، ئەویش وایزانی ڕۆبرتە، بۆیە ڕایکردەوە ناو جێگاکەی. ژنەکە هات و دەستی بەسەریدا هێنا و لە ئامێزیی گرت و داوای لێی کرد بگرییێت و با پەنگ نەخواتەوە. چونکە گریان زۆر جار خەمەکانمان لەگەڵ خۆیدا ڕادەماڵێت. پاشان بردییە حەمامەکە و ئاوەکەی بەردایەوە، داوای لێی کرد هەوڵ بدات گیانی خاو بکاتەوە؛ هەست بکات کە ئاوەکە وەک دەستێکی پیرۆز دەیشێلێ و ئازارەکانی جەستە و دەروونی دەرەوێنێتەوە. خاولییەکەی هێنا و وشکی کردەوە و جلی خەوی کردە بەری، بە دیاریەوە دانیشت تا خەوی لێ کەوت. بەیانی زوو بوو خەبەری بوویەوە، ڕووناکی نەدەبینی، پێش چاوی تاریک و لێڵ بوو. چاوی نووقاند و بەتانییەکەی دا بە خۆیدا. هەستی دەکرد خەڵکەکە لە هاتوچۆدان و لەوانەیە کۆرسەکەیش دەستی پێکردبێت. ئەو ئەمەی بە لاوە گرنگ نەبوو، ئەو دەیویست کونێک بدۆزێتەوە و تێیدا خۆی بشارێتەوە و جارێکی تر ڕۆبرت نەبینێ. ئەویش لە دەرگاکەی دا و بە هێمنی هاتە ژوورەوە و بەتانییەکەی لەسەری لا برد و بە ڕوویەکی خۆشەوە وتی «نەمزانی هێندە لە ماچ دەترسی،

ئەگینا ماچم نەدەکردی.»ئاڤێستا پێکەنی و بەتانییەکەی دایەوە بەسەر خۆیدا.»برۆ لاچۆ تۆ چۆن شتی وا دەکەیت خۆ تۆ ژنت هەیە«. ڕۆبرت لە قەراغی جێگەیەیدا دانیشت و جارێکی تر بەتانییەکی لەسەری لا برد و وتی «ئەوەی من ژنم هەیە هیچ شتێ لەو ڕاستییە ناگۆڕی کە من و تۆ یەکترمان خۆش دەوێت و من و تۆ دەبێت بۆ یەکتر بین. من کە تۆم دۆزییەوە ئیتر هەستم بە هیچ جۆرە بەختەوەرییەک نەکرد لەگەڵ ژنەکەمدا. بۆ زانین بێویست و بڕیارێ پەیوەندیم لەگەڵ ژنەکەمدا تا دێت ساردتر دەبێتەوە. پاش ئەوەی خۆشەویستنی تۆ ڕۆحی داگیر کردم، نەمتوانی لەزەت و خۆشی لە جەستە و ڕۆحی ژنەکەمدا بدۆزمەوە. من ئامادەنیم واز لە تۆ بهێنم. تۆ ژیانی منی، تۆ ڕووناکیی منی. من هەرگیز وازت لێ ناهێنم. ئەوەی ڕاتکرد لە ئامێزم پەیوەندی بەوەوە نییە کە من ژنم هەیە، بەڵکوو پەیوەندیی بە خۆتەوە هەیە. تکایە دڵت بکەرەوە و باسی هەموو شتێکتم بۆ بکە، دڵنیا بە من دەتوانم یارمەتیت بدەم. کەسێ نادۆزیتەوە وەک من تۆی خۆش بوێ و لێت تێبگات. من ئامادەم لەگەڵتدا بەو کۆلانە تاریکانەدا برۆین کە پێدا تێپەریوی، پێکەوە هەردووکمان لەهەر سووچێکی ئەو کۆلانانەدا چرا هەڵدەکەین.»

ئاڤێستا هیچی نەگوت، تەنیا ئەوەندە نەبێت کە دەیەوێ بگەڕێتەوە. ڕۆبـرت داوای لێی کـرد خـۆی ئـامـادە بکات، تا بگەڕێنەوە. لەگەڵ ئەوەی کۆرسەکەیان چوار ڕۆژی مابوو. ئاڤێستا ویستی خۆی بەتەنیا بگەڕێتەوە، بـەڵام ئەو ڕازی نەبوو، هەربۆیە هەردووکیان پێکەوە گـەڕانـەوە. بە درێژایی ڕێگەکە هەردووکیان بێدەنگ بـوون. لە دوا ساتەکانی سەفەرەکەیاندا ئاڤێستا بەبێ ویستی خۆی سەری خستە سەرشانی ڕۆبرت و بەبێ دەنگی فرمێسکەکانی بە ڕوومەتیدا دەهاتنە خـوارەوە. ئەویش تەنیا دەستی خستە سەرشانی و لە خۆی نزیکی

کردەوە و بێدەنگ بوو. هیچ پرسیاریکی لێ نەکرد، دەیزانی کاتێ دێت هەموو شتەکانی بۆ باس بکات.

ئەوە چەند مانگێکە بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕبووە، ئاڤێستا وەک هەموو جاران هەفتەی جارێک دەچێت بۆ یۆگا. تەنیا لەوێ یەکتر دەبینن. لەو ڕۆژەیشەوە کەسیان باسی ئەو شەوە ناکەن. تەنیا کە یەکتر دەبینن، یەکتر لە ئامێز دەگرن و بزە و نیگاکانیان لێک دەئاڵێن و خۆشییەکی بێسنوور بەیەک دەبەخشن. تەنیا بیرکردنەوە لەیەکتر موچڕکەی خۆشی بە هەردووکیاندا دێنێ. ڕۆبەرت چاوەڕوانە و ئامادەیە تا دوا ساتەکانی ژیانی چاوەڕوانی ئەو کاتە بکات کە ئاڤێستا لە دەرگاکەی دەدا و دڵی خۆی دەکاتەوە بۆی. ئەو پەلەی نییە چونکە دەزانێ ئەو کاتە هەر دێت. ئاڤێستایش ڕۆژ بە ڕۆژی هەفتە دەژمێرێ تا ڕۆژی هەینی بێت و بچێت بۆ یۆگا و ڕۆبەرت ببینێ. ئەو بینینە هێندە وزە و هێزی دەداتێ کە بەشی هەفتەکەی بکات. کەچی لەوەتی دەریا هاتووە، هەموو هەفتەیەک وەک جاران ناڕوات بۆ یۆگە. ڕۆبرت چاوەڕوانی دەکات و ئەو دەرناکەوێ، تاسەی بینینی ئاڤێستا ئۆقرەی لێ دەبڕێ. کەچی نایەوێ پەیوەندی پێیەوە بکات. دەزانێ شتێکی تازە لە ژیانی ئەودا ڕووی داوە، ئەگینا ئەو هەموو هەفتەیەک لەکاتی خۆیدا دەهات. حەزی دەکرد بزانێ ئەو شتە چییە، بەڵام هەر چاوەڕوانە خۆی بێت و شتەکانی بۆ باس بکات.
ئاڤێستا هاتە ژوورەوە بە دوو کیسی خواردنەوە. کە ڕێزانی بینی تووشی دڵەڕاوکی بوو. بێ ئەوەی بەخێرهاتنی بکات و هاواری کرد»خۆ هیچ ڕووی نەداوە؟». دەریا نەیهێشت وەڵام بداتەوە و وتی «نا، تۆزێ لەمەوبەر تەلەفۆنی کرد، وتی لەم ناوەم، منیش پێیم وت وەرە بۆ ئێرە، دادە ئاڤێستایش بەمزووانە دێتەوە، وەرە بۆ ئێرە پێکەوە نانێک

دەکەین و دەیخۆین. دەی ڕێزان بچۆ تۆ پشوویەک بدە، من و دادە خواردن ئامادە دەکەین.»ڕێزان سەیرێکی دەریای کرد و دەستی کرد بە پێکەنین و وتی «ئای چەند عەیاری! هەر لە دایکت دەکەی.»ئاڤێستا چاوەکانی زەق کردەوە و وتی «بۆ تۆ دایکی دەناسی؟»ئەمجارەیشیان دەریا هەڵیدایەوە بە هێمنییەوە وتی «مەبەستی تۆیە.»

ئەو ساتەی ئاڤێستا خەریکی دروستکردنی خواردن بوو، دەریا هاتە لایەوە پرسیی «ئاڤێستا تۆ برادەری کورت نییە؟»ئاڤێستا پێکەنی، سەری سووڕ ما لەو پرسیارە، چونکە لەو ساتەدا ئەو بیری لە ڕۆبرت دەکردەوە. بەبێ ئەوەی وەڵام بداتەوە دەستی کردە پێکەنین. ئاڤێستا وەک جاران مۆمەکانی سەر مێزی نانخواردنەکەی داگیرساند و وتی «دەزانی برادەرێکی کورم هەیە، زۆر میهرەبانە، بەڵام تا ئێستا ناوێرم نزیکی بکەومەوە. دەترسم.»

دەریا بە وردی گوێی بۆی دەگرت و چاوەکانیی بڕییە ئاڤێستا و وتی»بانگی بکە بۆ ماڵەوە با من بیبینم، خێرا پێت دەڵێم. گەر پیاوێکی باش بێت.»
ئەو دەیزانی ئەو پیاوێکی باشە و ئەمی زۆر خۆش دەوێت، گرفتەکە لە خۆیدایە. چۆن بتوانێ لەگەڵ پیاوێکی تردا بژییت و بڕوای بە یەکێکی تر بکات. لەو ساتەدا دەریا وتی «مەترسە هەموو پیاوەکان وەک یەک نین. لەبەر پیاوێکی خراپ کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بینیووتە، با هەموو پیاوەکانت لە پێش چاو نەکەون و ژیان لەخۆت تێکمەدە. دڵت بکەرەوە بۆ ئەو کەسەی خۆشی دەوێت و شەرم مەکە.»

ئەم قسانەی دەریا ترسی خستە دڵیەوە. ئەم قسانە لە قسەی منداڵێکی

هەشت نۆ ساڵان ناکەن. ئەمە یەکەمین جار نییە دەریا وەک مرۆڤێکی گەورەی بە ئەزموون دەبینێت. بەزەیی پێدا دەهاتەوە، چۆن لەم چەند ساڵەی تەمەنیدا ئەوەندە شتی بینییوە وا زوو گەورەبووە. تەنانەت لە هەڵسوکەوتیدا وەک منداڵێک نییە. هیچ جارێکیش کە دەچنە بازاڕ دەست بۆ یارییەکی منداڵان نابات. ئەوەی تەنیا دەیەوێ بیکڕێ کتێب و فیلمە. تەنانەت ئەو کتێب و ڕۆمانانەی دەیکڕێ بۆ تەمەنی لە خۆی گەورەترە. کتێبی منداڵان ناکڕێ. لەوەش ناگات چۆن پاش دوو ساڵ لە قوتابخانە وا باش دەتوانێ بخوێنێتەوە. لەوەی دەکرد کاتێ لە ماڵ ئەندەش و لێنا بووە، ڕێگای هیچ شتێکیان لێنەگرتووە. بە ئارەزووی خۆی کتێبەکانی ئەوانی خوێندووەتەوە و لەگەڵیاندا هەموو ئەو فیلمانەی بینووە کە ئەوان سەیرییان دەکرد. هەر بۆیەش مامۆستاکانی هێندە باسی زیرەکی دەریا دەکەن. ئاڤێستا ئا بەم جۆرە زیرەکی و هەڵسوکەوتەکانی دەریای شیدەکردەوە. نەیدەزانی هۆی بلیمەتییەکەی لە چیدایە. لە هەمان کاتدا دەریا گەرمییەکی بە ماڵەکەی بەخشیوە و بۆشاییەکی گەورەی بۆ پڕکردوەتەوە. لەو لاوە ڕێزان هاواری لێ هەستاو وتی «ئەرێ ئەم خواردنە چی بوو وا ئامادە نەبوو، وا خەریکە دەمرم لە برسانا.»

هەرسێکیان پێکەوە نانی ئێوارەیان خوارد. وابزانم دەریا پاش کۆچیدوایی دایکی بە قەد ئەم ئێوارەیە هەستی بە ئارامی و شادی نەکردووە. چوونە هۆڵەکە دەریا پرسی»ئێوە چۆن یەکتریتان ناسی؟». هەردووکیان دەستیان کرد بە پێکەنین. لەبەر پێکەنین کەسیان نەیاندەتوانی باسی بکەن. هەر کە دەستیان پێدەکرد، دەیاندایە قاقای پێکەنین و نەیاندەتوانی تەواوی بکەن. دەریاش بێ ئەوەی بزانێ مەسەلەکە چییە لەگەڵیاندا پێدەکەنی و چاوەڕوان بوو پێکەنینەکەیان بوەستێ و باسی ئەو ڕۆژە بکەن. بەڵام من ئێستا خۆم بۆتان باسدەکەم ئەو دووانە چۆن یەکترییان

ناسی.

ڕێزان لەگەڵ دوو منداڵەکەی چوونە ئەیانەپا لە قوبرس. ئا لەو کاتەشدا ئاڤێستا لەوێ بوو. بە ڕێکەوت هەردووکیان لە هەمان هوتێلدا بوون. ئاڤێستا چەند جارێ گوێی لە ڕێزان بوو بە کوردی قسەی لەگەڵ منداڵەکانیدا دەکرد. بۆیە بەپێی توانا خۆی لێلادەدا و هەوڵی دەدا کە نەزانێ ئەم کوردە. تەنانەت بۆ مەلە دەچووە شوێنێک تۆزێ دوورتر بوو لە هوتێلەکە تەنیا بۆ ئەوەی ڕووی نەتەقێ بە ڕوویەوە. بە شێوەیەکی گشتی کوردەکان دەموچاوی یەکتر دەناسنەوە. دوو ڕۆژ بوو ئاڤێستا ئەوانی نەدەبینی. وایزانی ئەوان ڕۆیشتوونەتەوە، بۆیە چووە سەر کەناری دەریاکەی سەر بە هوتێلەکە. بەبێ ئەوەی ئاڤێستا ئاگای لێبێت، ڕێزان بە خۆی و منداڵەکانییەوە هاتنە تەنیشتییەوە. ئەو کاتە ئاڤێستا لە ناو ئاوەکەدا دانیشتبوو، هەندێ جوڵەی یۆگای دەکرد. کچەکەی پرسی»دایە ئەو کچە چی دەکات؟»دایکیشی لایەکی کردەوەو وردبوویەوە لە ئاڤێستا و وتی «وەڵا کچم نازانم چی دەکات. لەوانەیە شێت بێت، شێتیش زۆر جۆری هەیە. ئەمە شێتی ناو دەریایە، کە دەچێتە ناو دەریا فێی لێدێت.»ئاڤێستا کە گوێ لەم قسانە دەبێت خۆی تێک نادات و وانیشان دەدا لێی تێناگات. پاش ماوەیەک دەچێتە سەر جێگەکەی خۆی پاڵدەکەوێت. ڕێزان هاوار دەکاتە کوڕەکەی دەڵێت»سەگباب وەرە لێرەوە یاری بکە. لەم ناوە دوور مەکەوەرەوە.»پاشان بە ئەسپایی لەبەر خۆیەوە دەڵێت»خۆزگە ئەو باوکە سەگبابەتم دەست دەکەوت لە ناوەڕاستی ئەم دەریایەدا نقومم دەکرد.»ئاڤێستا بە زۆر پێکەنینەکەی ڕادەگرێ. ئەوجا بەردێک دەگرێ بە دەستییەوەو دەڵێت»ئێستا وا دادەنێم ئەم بەردە ئەو حەرامزادە گەوادەیە، ئێستا لەناو ئەم لمەدا لە گۆڕی دەنێم و نایەڵم هەناسەش بدات. ئەم بەردەی تریش ئەو

ساختەچیە درۆزنـەی ترە کە خۆی لەمن کرد بە مەلائیکەو دەرچوو حیزێکەو لە وێنەی نییە. ئەمەشیان لە ژێر پێمدا و لەناو ئەم لمەدا لە گۆڕ دەنێم و پاشان هەردووکیان بە جووتە لەناو دەریاکەدا نقوم دەکەم نایەڵم هەناسە بدەن.»ئا لێردا ئاڤیستا خۆی بۆ ڕانەگیراو دایە قاقای پێکەنین و ڕووی تێکرد و وتی «نەمزانی ژنە کوردێکی وا ئازا هەیە دوو کۆنە مێردی وا بە ئاسانی بخاتە ژێر لمەوە.»هەردووکیان دایانە قاقای پێکەنین، ڕێزان هەڵیدایەو وتی «خاتە تۆش کوردی، خۆتت لێمان کردووە بە ئەوروپی ، ئەی ئەم لنگە فرتێیەت چی بوو لەناو ئەم ئاوەدا . زراوی کوڕەکەمت برد. نەگبەت خۆ سەروشکڵیشت لە عەوروپی ناکات، وتم لەوانەیە عەرەب و مەرەب بێت. دەی بزانم تۆش گەوادێ یان حیزێکت هەیە لەناو چاڵی بنێت.»ئاڤیستا لەبەر پێکەنین هیچی بۆ نەدەوترا. لەوەتی هاتبووە ئەم وڵاتە هێندە گوێی لە جنێو نەبیوو. ڕێزانیش وتی «ئێ ڕۆڵە ڕۆحم دەرچوو، دڵم خەریکە شەق دەبات، کە چوومەوە کوردستان خۆی لێی کردمە مەلائیکە، لە خۆشیا نەمزانی چی بکەم. کچێ مەبەستم مێردی دووەمە بە خێرێ، ئێ پوولم بە دوانەوە ناوە. چەند جارێ بینیم خەریکبوو گەشکە بکەم، وتم ئەم پیاوە لە ئاسمانەوە بۆ من هاتووەتە خوارەوە. من بە دوای پیاوێکی وادا دەگەڕێم. ئەمجارەش هەر خۆم بڕیارم دا شوو بەم پیاوە بکەم. خوا هەڵناگرێ دایک و باوکم هەرچەند لەگەڵ ئەوەی ناڕازی بوون، بەڵام قسەیان نەکرد. خۆ شووی یەکەمیشم هەر خۆم هەڵمبژارد. لە هەردووکیدا فەشەلم هێنا. ئەوەی یەکەم منی ڕاکێشایە ئێرە. بەڵام خۆم بە ملی شکاوم ئەوەی دووهەمم ڕاکێشایە ئێرە. دەرچوو دوودەکییە. پاش چوار مانگ لە مانەوەی لێرە، شەوێکیان پێی وتم ، ببوورە من لەوە زیاتر ناتوانم پەیوەندی سێکسیم لەگەڵ تۆدا هەبێت، لەبەر ئەوەی تۆ یەکەمین ژنی من لەگەڵتا دەخـەوم. من پێشتر هەر لەگەڵ پیاودا

خەوتووم.»ئا لەو کاتەدا چەقۆیەکت بدایە لەدڵم پێم خۆشتربوو. هەڵسامەوە لێی وتم «ئێ بۆ پێشتر باسی هیچت نەکرد، ئەوە چوار مانگە من لەگەڵ حیزێکدا دەژییێتم و نازانم.»لە پێشدا بە شەرمەوە وتی «ئەمە تاقە ڕێگەیەک بوو بۆ من بۆ ئەوەی بتوانم بگەمە وڵاتێک نرخ بۆ کەسانی وەک ئێمە دادەنێن. لێرە ئەوە عەیب نییە بیزگ بیت.» ئەو شەوە بەتانییەکەم بردو لەگەڵ منداڵەکانم خەوتم. ئیتر نەمدەتوانی سەیری بکەم. ماوەیەک گوزەراندم لەگەڵیدا و دەمووت ناکرێ پاش چوار مانگ لەم جیا ببمەوە، کەسوکارو خەڵک چیم پێ دەڵین. ئەویش ئەمەی کردبوو بە چەکێک بە دەستییەوەو دەیوت»شەرم لەخۆت ناکەی پاش چوار مانگ لەمنیش جیا بیتەوە، بیر لەوە ناکەیتەوە خەڵک چیت پێدەڵێن، ئەی بیر لە دایکت و باوکت ناکەیتەوە، چەند خەفەتت بۆ دەخۆن. لە مێردی دووهەمیشت جیابیتەوە. ئێستا خەڵک دەڵێن خەتای خۆیەتی نەک مێردەکانی.»ئیتر من لێی بێدەنگ بووم. هەوڵمدەدا خۆمی لێ لادەم. لە ڕاستیشدا قسەکانی تا ڕادەیەک کاریان لێمکردبوو. پاش ئەوە هەستمکرد خەریکە شوڵم لێهەڵدەکێشی و ئەکەوێتە سنووردانان و هەڕەشەو گورەشە. وتم تا زووە با لە کۆڵی خۆمی بکەمەوە. بەیانییەک پاش شەڕی ئێوارەی پێشوو، هەستام و منداڵەکانم گۆڕی، لە جیاتی ئەوەی بیانبەم بۆ باخچەی ساوایان چووین بۆ ماڵی ژنان. هەر لە ڕێگەی ئەوانەوە هەموو کاری جیابوونەوەکەم تەواوکردو ناردیانەوە بۆ کوردستان. جا لە هەمووی خۆشتر دەیویست مەسەلەی هاوڕەگەزخوازییەکەی خۆی بکاتە بیانوو بۆ ئەوەی لێرە بمێنێتەوە. کە ڕۆیشت پێمووت»لەوێ دەبێت بڵێت کە تۆ نەتوانیووە لێرە بژیت، بۆیە گەڕاویتەوە، گەر وا نەکەی هەموو سلێمانیت لێ پڕ دەکەم. ها بە فەقیرم مەزانە.»

ئاڤێستا هەر سەری سوورمابوو لە ڕێزان، چۆن وا هەموو ئەم نهێنییانەی ژیانی خۆی باسدەکات لای ئەم کاتێ نای ناسێ و نازانێ کێیە. لەبەر پێکەنینیش قسەی بۆ نەدەکرا. پاشان ڕێزان وتی «من ناوم ڕێزانە، بیرم چوو خۆمت پێبناسێنم، مامۆستام و بێوەژنم و پوولم ناوە بە دوانەوە خوا گەورەشە بۆ دوانی تر. ئێ خۆت شووت کردووە؟ یان تۆش لە گروپی ئێمەیت، مەبەستم گروپی بێوەژنانە؟.»
ئاڤێستاش وتی «ناوم ئاڤێستایە، هێشتا شووم نەکردووە، تۆ دەمترسێنی!»
ڕێزانیش وتی «ناتترسێنم، بەڵام جارێ شوو مەکە با سەرت ڕەحەت بێت. ئاگات لێ نییە من لەوەتی هاتووم خۆم نەمتوانییوە پشوویەک بدەم، بەردەوام دەبێت چاوم لەو دووانە بێت. کەرەکەی باوکیشیان گەڕایەوە بۆ لای ژنی یەکەمی و خزمەتکاریی بۆ دەکات.»

ئا بەم جۆرە ئەوان یەکترییان ناسی. ئەو چەند ڕۆژەی کە مابوو، پێکەوە بەسەریان برد. زۆر جاریش ئاڤێستا ئاگاداری منداڵەکان دەبوو، لەگەڵیاندا یاری دەکرد و هەوڵی دەدا فێری مەلەیان بکات. هەردووکیان هەستیان بە خۆشی دەکرد لەگەڵ یەکتردا. بۆیە بڕیاریاریان دا کە گەڕانەوە بۆ ستۆکهۆڵم پەیوەندییەکەیان بەردەوام بێت. ئاڤێستا ڕێزانی زۆر خۆش ویست، ئەو زۆر کراوە بوو، بێ پێچوپەنا باسی هەموو ژیانی خۆیی بۆکرد. هەروا مەزاجی زۆر باشبوو، حەزی لە نوکتە وقسەی قۆڕبوو. بەڵام ئاڤێستا بە هیچ جۆرێ باسی ژیانی خۆیی نەدەکرد.

- 7 -

ئاڤێستاو دەریـا پەیوەندییان تا دەهـات قوولـتردەبوویـەوە. بەڵام هەردووکیان نهێنییەکانی خۆیان دەپاراست. ڕێزان هەموو هەفتەیە دەبووایە ئاڤێستا و دەریای ببینیایە. ئاڤێستا هەستیکردبوو شتێکی هاوبەش هەیە لە نێوان ڕێزان و دەریـادا. پەیوەندییان زۆر نزیکبوو لەیەکەوەو گەرمییەکی زۆری هەست پێدەکرد لە نێوانیاندا. چەند جارێک دەریای بینی لەسەر ڕانی ڕێزان پاڵدەکەوت ئەویش زۆر بەگەرمەوە لە ئامێزی دەگرت، ماچی دەکرد. ڕۆژێ ڕێزان بە دەریای وت»دەریا وەرە من تاقەتی شاردنەوەی ئەم نهێنییەم نییە، سکم عەماری کەس نییە. ئاڤێستا وەرە، من باسی شارام بۆ کردی، باسی دەریای کچیشم بۆ کردی. ئەمە ئەو دەریایە کە باسم کرد.»دەریا و ئاڤێستا سەیرێکی یەکترییان کرد و هەردووکیان خەم و حەپەساوی لە چاویاندا بەدی دەکرا. دەریا ڕایکردە ژوورەکەی خۆی و نەیدەزانی ئاڤێستا هەڵوێستی چی دەبێت کە ئەم ڕاستییە بزانێ. ئەمە جگە لەوەی ماوەیەکی باشە ئەم نهێنییەیان لەو شاردووەتەوە. ئاڤێستا فرمێسکەکانی هاتنەخوارەوە چووە ژوورەکـەی دەریـا. باوەشی پێداکرد و وتی «وەرە کچەکەم، مەگری، دەمزانی خەم و ترسێکی گەورەت بەسەر شانەوەیە، ئیتر لەمەودوا پێویست ناکات ئەو بارە هەڵگری. نایەڵم لەمەودوا ئازار بچێژی. من ناتوانم وەک دایکت بم بۆ تۆ بەڵام بەڵێنت پێدەدەم، وەک دایکێکی دڵسۆز ئەوەی لە توانامدا بێت بیکەم بۆت. ڕێزانیش وەک پورت دەبێت.»ئا لەو کاتەدا ڕێزانیش هاتە ژوورەکەی دەریاوە و زۆر بەکوڵ دەگریا. لە لەنێوان هەرووکیاندا دانیشت و پاشان دەریای لە ئامێزگرت وتی «دەریا گیان ببوورە، ئاڤێستا دەبوایە ئەم ڕاستییەی بزانیایە. بۆ تۆش باشترە. بەڵام لەوانەبوو باشتربووایە ئا بەو جۆرە قونبەلەکەم نەتەقاندایەتەوە. خۆت من دەناسی دەزانی چۆنم.»هەردووکیان دەستیان

کرد به پێکەنین.

ئەو ئێوارەیە تا درەنگانێ هەرسێکیان پێکەوە بوون. پاشان ڕێزان لەبەر منداڵەکانی کە لە ماڵی دراوسێکەیان بوون دەبووایە بگەڕایاتەوە بۆ ماڵەوە. دەریا وتی «لەمەودوا دەتوانی هەندێ جار من لای خەندەو سەرکەوت بم. لەگەڵ ئەوەی هەمان تەمەنمان هەیە بەڵام تۆش من دەناسی.»

ئەو شەوە دەریا و ئاڤێستا پێکەوە لە ژوورەکەی ئاڤێستا خەوتن. ئاڤێستا دڵی بۆ ئەو کچە هەشت ساڵانە کردەوە. وای هەستی دەکرد لەگەڵ داپیرەیەکدا قسەدەکات. باسی پەیوەندی خۆی و ئەو پیاوەی بۆ کرد، باسی ئەوەی کرد چۆن لێرە منداڵەکەی لەبارخۆی برد. منداڵەکەی کچ بوو. ئەو پێشتر بڕیاری دابوو گەر کچی بێت ناوی دەنێت دەریا، لەگەڵ ئەوەی تا ئەو کاتە دەریای هەر لە فیلمدا بینیبوو. بەڵام دەریا بۆ ئەو کاتەی پێویستت بە هێمنییە، هێمنیت پێدەبەخشێ، تووڕەییە بۆ ئەو کاتەی تووڕەیی وەک شەپۆل داگیرت دەکات. گەر کوڕ بوایە ناوی دەنا چیا، چیای لە کوردستاندا بینبوو، چیا بۆ ئەم مانای خۆڕاگری و کۆڵنەدان بوو، ئەم هێمایەش بۆ ئەم پێویست بوو بۆ ئەوەی بتوانێ لەپاڵ ئەم کوڕەیدا خۆڕاگر بێت. کەچی ئەو زاڵمە فەرمانی پێدا ئەو منداڵە لەناو ببات. ئێستا زۆر پەشیمانە، بەڵام وا خوا دەریایەکی پێبەخشی کە دەتوانێ ئازارەکانی پێ هێوربکاتەوە. دەریاش باسی خۆیی بۆ کرد. باسی دایکی بۆکرد. ئەو ساتانەی لەیادە چۆن باوکی بە زۆر شەوان لەگەڵییدا دەخەوت و چۆن ئەم دەگریا و نەیدەهێشت بێت بەلایدا. شێوەی دایکی هەر لەبیرە، دایکی کە ئەمی بوو تەمەنی هێشتا نەبووبوو بە هەژدە ساڵ. باڵای بەرز و باریکبوو، چاوەکان و قژی هەنگوینی

بوون، كه تيشكی هەتاو لێيدەدا دەبووه قاوەييەكی مەيلەو زەرد. پێستی ئەسمەرێكی كاڵ بوو. لە سەرەتاوه قژی درێژ بوو. پاشان بڕی و كورتی كردەوه. ئەوەندەی ئەو دايكی لە ياد بێت قەد بە دڵخۆشی نەيبينيووه. تەنيا ئەو كاتانەی لای ڕێزان و هەتاو بوو پێكەنينی لە سەر لێو بينييوه. دايكی زۆر بێهێز بوو، وا هەستی دەكرد بەبێ دايكی هيچی بۆ ناكرێ و ناتوانێ بژی. هەر خۆشەويستی بۆ دايكيشی بوو وای لێی كرد بگەڕێتەوه و پاشان بيكوژن. زۆر جار دەڵێم بێهێزی كەسايەتی دايكەكانە وا دەكات كچەكانيشيان وا بێدەسەلات و زوڵم قبوڵكەر دەرچن. هەر دايكی بوو شارای ڕازی كرد كه بگەڕێتەوه، لە كاتێكدا دەيزانی ئەو پلانەی بۆ دانراوه. هەروا دەيزانی مێردەكەی ماوەيەكه بە دوای يەكێكدا دەگەڕێت ئەو پلانەی بۆ جێبەجێبكات. لە كۆتاييدا پياوێكی تايلەندی دەستكەوت بە پارەيەكی زۆر و بەڕێگەيەكی تايبەتی بيكوژن بە شێوەيەك كەس نەزانێ كه كوژراوه. هەرچەندە ئێستا بۆ هەر كۆڕو كۆمەڵێك دەڕۆن كوردەكان دەستيان بۆ درێژدەكەن و دەڵێن كچەكەيان مێردەكەی بەجێ هێشت و پەنای بردە بەر سوێدييەكان. كه هاتيشەوه لە ژووركەی خۆيدا خۆی كوشت. واتە ئێستا بەپێی بۆچوونی خەڵك دوو تانە بەناو چاوانيانەوەيە. دايە گەورە باری تەندروستی باش نييە، زۆربەی كات لە ماڵەوەيەو جاری وا هەيە بە هەفتەيەك لەناو جێگەكەی خۆی دەرناچێ. بابەگەورە تەواو پيربووەو زۆر بەزەحمەت دەتوانێ بە تەنيا چەند هەنگاوێ بڕوات. هەموو ئەو شتانەی كه بەسەريان دێت بە تاوانی شارای دەزانن. نايانەوێ هيچ كەسێ باسی ئەو يان دەريا بكات. نازانن هەموو ئەو ئازارەی كه دەيخۆن لە ويژدانی خۆيانەوه سەرچاوه هەڵدەگرێ نەك لە شاراوه. كچەكەيان لە تەمەنێكی منداڵييەوه دا بە شوانێكی قەد پاڵ شاخەكان و هێنايانە سوێد. ئاخر ئەو بەستەزمانە چۆن بتوانێ جياوازی نێوان ئەو دوو كولتووره جياوازه هەزم بكات

و لێی تێبگات. وه‌ک دارده‌سته‌ی مامی وابوو. به‌پێی ئامۆژگارییه‌کانی ئه‌و ده‌جولایه‌وه. ژیانی شارا بووه دۆزه‌خێکی سه‌رزه‌مینی. شارا سه‌ری لێشێوا، نه‌یده‌زانی به چ جۆرێ ره‌فتاربکات. هه‌رچی ده‌کرد هه‌ر هه‌ڵه‌بوو، سزاکه‌شی لێدان و سووکایه‌تی پێکردن بوو. ته‌نانه‌ت ئه‌و کاتانه‌شی سکی به ده‌ریاوه هه‌بوو، شه‌و نه‌بوو بێ تێهه‌ڵدان بخه‌وێ. ئه‌و له هیچ شتێکدا مافی نه‌بوو بڵێت نه‌ء. باوکی ده‌یویست برازاکه‌ی وه‌ک خۆی و به‌هه‌مان شێوه له‌گه‌ڵ کچه‌که‌یدا بجوڵێته‌وه. تێگه‌یشتنی کات و شوێن لای ئه‌و بوونی نه‌بوو، بۆیه هه‌رگیز گۆڕانکارییه‌کانی نه‌ده‌بینی. لای ئه‌و کات وه‌ستابوو. ره‌نگه‌کانی نه‌ده‌بینی. مۆسیقا به‌ر گوێی نه‌ده‌که‌وت. هه‌موو شت لای ئه‌و گۆڕستانێکی خامۆش بوو.

پاش کوشتنی شارا، ژیان لای ئه‌و پیره‌مێرده‌و داپیره‌یه، به‌رگی مردنی پۆشی. ده‌ڕۆیشتن و ده‌هاتن و نانیان ده‌خوارد و هه‌ناسه‌یان ده‌دا، به‌ڵام هه‌ستیان به هه‌ناسه‌و لێدانی دڵیان نه‌ده‌کرد. جیاوازی نێوان شه‌و و ڕۆژیان نه‌ده‌بینی. شارا وه‌ک سێبه‌ر له‌گه‌ڵیاندا بوو. هه‌ر ئه‌مه‌شبوو وای لێی کردبوون به هیچ شێوه‌یه‌ک نه‌یان ده‌ویست ده‌ریا لای خۆیان بهێڵنه‌وه. له هه‌ناسه‌و هه‌نگاوه‌کانی ده‌ریادا شارایان ده‌بینی. خه‌ڵکی ده‌یوت پاش مردنی کچه‌که‌یان ئه‌و دووانه په‌کیان که‌وتووه داته‌پیوون. نه‌یانده‌زانی پاش کوشتنی کچه بێ تاوانه‌که‌یان ویژدانیان ده‌یانکرۆژێ و ڕۆژ له‌دوای ڕۆژ هێزیان لێ ده‌مژێ. کاتێ مرۆڤه‌کان تاوانی وا سه‌خت ده‌که‌ن، هۆشیان جه‌سته‌یان جێده‌هێڵێ و ئاماده نییه له جه‌سته‌یه‌کدا بمێنێته‌وه که ڕۆحێکی وا بێ تاوان هه‌ڵواسێ، بۆیه وه‌ک جه‌سته‌یه‌کی بێ ڕۆحیان لێدێت و که ده‌ڕۆن به ڕێگه‌وه وه‌ک دارێکی له ڕه‌گ هه‌ڵکێشراو ده‌یانبینی. ئه‌و داره ده‌ڕوات و ده‌ڕوات بۆ ئه‌وه‌ی خاکێ بدۆزێته‌وه و ڕه‌گه‌کانی تێدا داکوتێ، به‌ڵام هیچ پارچه‌یه‌ک له‌و خاکانه‌ی به‌لایدا

تێپەڕدەبن ڕازی نابن ڕەگی ئەو دارە لە ئامێز بگرێ. ئەو دارەی پشتی کردە ئەو خاکەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان تۆوەکەی بە گەرمی لە ئامێزگرت و دەرگای بەرەو هەتاو بۆ کردەوە. جارێکی دی هەمان خاک دالْدەی ئەو ڕەگە نادا. ئەوەی پشت لە خاکەکەی خۆی بکا بێ خاک و بێ هەتاو دەمێنێتەوە. ئەو دوو پیرە ئاخرشەرە نە لە ماڵەکەی خۆیاندا و نە لە دەرەوەی ماڵەکەی خۆیاندا و نە لە کوردستاندا ئارامیان نەدەگرت. دەچوونە هەر کوێ تارمایی شارایان دەبینی، گوێیان لە دەنگی شاراو کوڕوزانەوەی شارا دەبوو. شەوان دەبووایە حەبی خەویان بخواردایە تا خەویان لێبکەوتایە. کوڕەکانیشیان نەیاندەتوانی یارمەتیان بدەن. ئەوانیش ڕقێکی گەورەیان بەرامبەر خوشکەکەیان لە دڵدا بوو. نەیاندەزانی ئەمەی بەسەریان هاتووە هەڵەی خوشکەکەیان نییە، بەڵکو هەڵەی بیرکردنەوەی بەردینی باوکیانە. هیچ یەکێ لە کوڕەکانیان تا ئەو ماوەیە ژنیان نەهێنابوو. پەیوەندیشیان لەگەڵ هیچ کچێکدا بەردەوام نەدەبوو. زۆر دڵڕەقانە مامەڵەیان لەگەڵ ئەو کچانە دەکرد کە دەهاتنە ژیانیانەوە. ژیانیان بێ ڕەوت و ئامانج بوو. پەیوەندییان لەگەڵ دایکو باوک و خزمەکانیاندا زۆر دیاریکراو بوو. بەردەوام هەوڵیان دەدا لە کەسانێ نزیک بکەونەوە کە کورد نەبن. لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام وا هەستیان دەکرد کە خۆکوشتنی خوشکەکەیان لەسەر ناوچەوانیان نووسراوە. من خۆم زۆر بەزەییم بەو خێزانەدا دێتەوە، گەر نزیک بوومایە لێیانەوە هەوڵمدەدا یارمەتیان بدەم. بەتایبەتی کوڕەکانیان. شایانی ئەوە نین ژیانیان بەو شێوەیە بەڕێوە بڕوات.

دیارە هەموو چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کە باسی ئاڤێستاو دەریاتان بۆ بکەم . پەلە مەکەن دێمەوە سەر ئەوانیش. ئەو شەوە کەسیان خەویان لێنەکەوت، قسەکانیان تەواو نەدەبوو. دەمەو بەیانی بوو خەو بردنیەوە.

بۆ سبەینێ درەنگانێ خەبەریان بوویەوە. لە قوتابخانەوە تەلەفۆنیان بۆ ئاڤێستا کرد، کاتێ تەماشای سەعات دەکات نزیکی نۆیە. داوای لێبووردنی کردو خێرا خۆی لەبەرکرد و چوو بۆ کار. ئاڤێستا تەلەفۆنی کرد بۆ قوتابخانەکەی دەریا و بە نەخۆشی لە قەڵەمدا. بۆیە دەریا باوەشی کرد بە کەرویشکەکەیدا و خەوتەوە. ئاڤێستا وتی «بخەوە تا من دێمەوە، هەوڵدەدەم زوو بێمەوە.»

دەریا خەوتەوە. هەستی بە گەرمی و خۆشەویستییەکی زۆر کرد. چاوی کردەوە بینی دایکی لە پاڵیدا پاڵکەوتووە. چووە باوەشییەوە. تێر یەکترییان ماچ کرد. کەسیان نەیان دەویست قسە بکەن یان چاویان بکەنەوە، وزەی هەردووکیان وا تێکەڵببوو جیاکردنەوەو خەبەرکردنەوەیان مەحاڵبوو. ماوەیەکی ویست تا هەردووکیان هۆشیان هاتەوە سەرخۆیان. دەریا بە چرپە وتی «دەمزانی هەر دێتەوە بۆ لام، من چاوەڕوانی ئەم ساتەم دەکرد. زۆر جار گوێم لە دەنگت دەبوو، بەڵام گوێی خۆمم کەڕدەکرد، نەمدەویست دان بەو ڕاستییەدا بنێم. دەزانی چەند ئازارم چەشت. هەر دەبێت حەقی تۆیان لێبکەمەوە. بۆیە تا ئێستا خۆمم گرتووە. دەمەوێ گەورە بم. وازیان لێناهێنم.»دایکی لە ئامێزی گرتەوەو وتی «ئەوان سزای خۆیان وەرگرتووە، پێویست ناکات وزەی خۆت بەوانەوە خەساربکەیت. باوەڕ بکە ناگەیتە هیچ ئەنجامێک. ژیانت بە ڕەوتێکی ڕاستدا دەڕوات، بەرەو بەختەوەری و ئارامیت دەبات. هەوڵ مەدە ڕق لە دڵ هەڵگری، ئەو ڕقە وەک ژەهر وایە دەیکەیتە ناو جەستەی خۆتەوە. هەر ئەو ڕقەیە کە لە دڵتدایە ئەم ماوەیە ژیانی لێ تاڵکردووی و ئەو توانا تایبەتیانەشی کە هەتبوون، دوورکەوتنەوە لە ئاگایت. ئەو ڕقەی لە دڵتدا هەڵتگرتووە تەنیاو تەنیا ئازاری ڕۆحی خۆتی پێدەدەی نەک ئەوان. بۆیە کچە

سەرزەمینییەکەم داوات لێدەکەم جەستەی خۆت لەو ڕقە پاکبکەرەوە. بوار مەدە ئەو هەستە دەست بەسەر خۆشی ژیانتدا بگرێ. ئەو هەستە هەموو دەرگاکانی ئارامی و بەختەوەریت لێدەگرێ. هەوڵبدە بە تیشکی ڕووناکی هەتاو و مانگ جەستەت لەو ڕقە پاکبکەیتەوە. کە مانگە شەوە، پەنجەرەکەت بکەرەوەو لەبەردەم تیشکی مانگدا سوجدە ببەو داوای لێبکە گیانت لەو ڕقە پاکبکاتەوە، کە هەتاو بە ناوەڕاستی ئاسماناوەیە سوجدەی بۆ ببە و داوای لێبکە ئەو هەستە لە دەروونتدا دەربهێنێ. باوەڕ بکە هەر ئەو هەستەیە ئارامی و خۆشی لە مرۆڤەکان دەدزێ. مرۆڤەکان هەموو ژیانیان بە دوای ئەو بەختەوەریەدا دەگەڕین، نازانن ئەو گەوهەرە لەناو خودی خۆیاندایەو نای دۆزنـەوە، لەبەر ئەوەی دەروونیان پڕدەکەن لە هەستی ڕق و کینەو حەسوودی و تەماح. ئەوان ڕێگەیەکی دوور دەبڕن بۆ دۆزینەوەو دەرهێنانی ئەو گەوهەرە لە قوڵایی دەریا. بەڵام مخابن لەناو قوڵایی دەریـادا گۆڕ بۆخۆیان هەڵدەکەنن. تۆ وا دەزانی هێمنی دەروونیت لە تۆڵەسەندنەوەدایە، نەخێر، نەخێر کچەکەم تەنیا و تەنیا لە ڕێگەی لێبوردندایە. لێیان ببوورە، تالێیان نەبووری هەست بە ئارامی ناکەیت و ڕۆح و جەستەت لەگەڵ یەکدا ئاشت نابنەوە. ئامادەگی لێبووردنیش وەک گەوهەرەکە هەر لەناو دڵی خۆتدا دەدۆزیتەوە. دڵنیات دەکەم ئەو کاتە دەبیتە پارچەیەک لە خۆشەویستی و ڕووناکی. دەرگاکان لەبەردەمدا دەکرێنەوە. ئازاردانی کەسانی تر تەنیا ئازاردانت بۆ دەگەڕێنێتەوە. هەروەک چۆن تیشکێ دەخەیتە سەر ئاوێنەیەک ئەو تیشکە هەر بۆ خۆت دەگەڕێتەوە. ئەویش هەروایە. تەماشاکە ئەوانەی تەماحکارن و بە هیچ تێر ناخۆن چەند پارەیان هەبێت وا هەست دەکەن هیچیان نییە. ئەوەی لەگەڵ ژنەکەی یان پیاوەکەی خۆیدا هەست بە ئارامی و خۆشی نەکات و ئەوا لەگەڵ سەدان ژن و پیاوی تردا نایدۆزنەوە، لەبەرئەوەی ئەو ئارامییە لەناو

خودی خۆیاندایە و نایبینن. ئەوانەی بە پەرداخێ ئاو تینوێتیان ناشکێ، جۆگەیەکی لە کانییەک بۆ ڕاکێشە ماڵەکەی، هەر تینیوێتی ناشکێ. بۆیە سەرچاوەی هەموو ڕاستیەکان لە ناوەوەی خۆماندا هەڵدەقوڵێ. بۆیە هەر کاتێ بەدوای وەڵامی پرسیارێکدا گەڕای، بە هێمنی گوێ بۆ دڵت بگرەو وەڵامی ڕاستت دەداتەوە. ئێمە فێرکراوین گوێ لە وەڵامی مێشکمان بگرین، نازانین هەر مێشکە سەرچاوەی هەموو نەهامەتی و شەڕەکانە. هەر بڕیاری مێشکە خوێن دەرێژێ و دڵت لە سێدارە دەدات. گەر دایکم و باوکم گوێیان لە دڵی خۆیان بگرتایە هەرگیز ئەمەیان بەمن نەدەکرد. کە کردیان ئێستا دڵیان لێیان زویر بووەو جەستەی جێ هێشتوون هەربۆیە ئێستا جەستەیان بێ دڵە. ئەوانەی سەرچاوەی ئازارو ئەشکەنجەی کەسانێکی ترن، مانای بەختەوەری و ئارامی لەدەست دەدەن. باوەڕبکە ئەوەی هەست بەخۆشەویستی بکات ئازاری کەسانی تر نادات. هەروەک چۆن هەتاو لە ڕووناکی و گەرمایی زیاتر هیچی تر نابەخشی. مرۆڤەکانیش بەهەمان شێوە. ئەوەی شەوی لە دەروونیدا هەڵگرتووە لە تاریکی زیاتر هیچ شتێکی تر نازانێ. بۆیە ڕۆحە ئازیزەکەم دەمەوێ لەم ساتەوە ئەو نیازە توڕبدەیتە دەرەوە. دەمەوێ دڵت بکەیت بە دەشتاییەکی سەوزی پڕ گیاو گوڵ. دەمەوێ لە دوورەوە سەیرت بکەم تەنیا و تەنیا خەرمانەی سەوزایی ببینم. بەڵێنم پێبدە، بەڵێنم پێبدە.»

دەریا گریا... گریا... گریا، لەبەر هەنیسکدان هەناسەی بۆ نەدەدرا، دایکیشی دەیگوت «دەی بگری... دەی بگری... خۆت پاکبکەورەوە لە هەموو ئەو ڕقەی ئەم چەند ساڵە لەگەڵ خۆتدا هەڵتگرتووە. دەی بگری کچە جوانەکەم، ئەو ڕقە لە دڵدا مەهێڵە، دڵنیات دەکەم هەموو جیهان لەبەردەمتدا وەک گوڵێکی هەمیشە کراوە دەبێت. ئەو ڕقە لە دڵتدا بکەرە

دەرەوە. ئەو کاتە ژیان لەبەردەمتدا دەرگاکانی خۆی دەکاتەوەو باڵی ئارامی بەرەو ئەو شوێنەت دەبا کە دەتەوێ». دەریا نەیزانی کەی خەوی لێکەوتەوەو کەی دایکی بەجێیهێشت. دەمەو ئێوارە بوو ئاڤێستا هاتەوەو خەبەری کردەوە. دەریا کە هەستا لەخەو هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وا هەستی کرد جەستەی وەک جەستەی چۆلەکەیەکی بچکۆلانە سووکەو بەرەو ئەو شوێنەی کە دەیەوێ دەتوانێ بفڕێ. باوەشێکی کرد بە ئاڤێستایەو وتی «دەزانی دایە گیان زۆرم برسییە.»ئاڤێستا فرمێسکەکانی هاتنە خوارەوەو دەریای توند نوساند بە سنگییەوە.

گۆڕانکارییەکان بە خێرایی کات دەڕۆن. پەیوەندییەکانیش تا دێت قوڵ دەبنەوە. ئاڤێستا خەریکی خواردن ئامادەکردن بوو، دەریاش وەک هەموو جارێ بە دیارییەوە وەستابوو. ئاڤێستا لایەکی بۆ کردەوەو وتی «دەزانی ئەمڕۆ کێ تەلەفۆنی بۆ کردم. ڕۆبرت، کوڕەکەی برادەرم. ئەوە یەکەمین جارە تەلەفۆنم بۆ دەکات، لەگەڵ ئەوەی پێشتریش تەلەفۆنەکەی دەزانیم. لەوەتی تۆ هاتویتە لام، وەک جاران نەچووم بۆ یۆگا. بۆم باس کرد کە تۆ لام دەژییت. لەپێشدا نەیزانی مەبەستم کێیە، کاتێ وتم ئێستا بە تەنیا ناژیم، لەگەڵ کەسێکدا دەژییتم کە کاتی دەوێت و دەبێت ئاگام لێبێت. بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو، نەیزانی چی بڵێ. پاشان پێم وت ئەو منداڵەی بەتەمای بووم، وەرم گرت. ئەو کات دایە قاقای پێکەنین و وتی «پیرۆزە.»نەمزانی چۆن لە دەمم هاتە دەرەوە و وتم گەر دەتەوێ ئەم ئێوارەیە وەرە لەگەڵماندا نانی ئێوارە بخۆ. دوایی پەشیمان بوومەوە، بەڵام نەمتوانی قسەکەم بگۆڕم. ببوورە پرسم بە تۆ نەکرد، دەزانم هەردووکمان زۆر ماندووین.». دەریا بزەیەک گرتی وهاتە تەنیشتییەوەو وتی «هەر کە هاتیتە ژوورەوە زانیم دڵت بە شتێ زۆر خۆشە.». دەریا ڕاستی کرد، ئەویش زۆر بیری ڕۆبرتی دەکرد.

نەیدەزانی پاش ئەو شەوە چۆن لەگەڵیدا دەست پێبکاتەوە. هەموو جارێک کە دەیبینی لە چاوەکانیدا چاوەڕوانی وەڵامێ بوو. هەموو جارێ هۆڵی یۆگای بەجێدەهێشت، بەبێ ئەوەی ئەو وەڵامە وەربگرێ. ڕۆبرت پەلەی نەبوو، دەیزانی ئەو کاتە دێت.

ئاڤێستا مێزی ڕازانــدەوە، مۆمەکانی داگیرساند. داوای لە دەریا کرد هۆڵەکەو ژووری نووستنەکان ڕێکبخات. مۆمەکانی هـۆڵ و حەمامەکەش داگیرسێنێ. دەریـا هەموو جارێ سەری سوڕدەما لە ئاڤێستا کە ئەم هەموو مۆمە دادەگیرسێنێ. هیچ ئێوارەیەک ئەوەی لەیاد ناچێت مۆمەکانی داگیرسێنێ. ئێوارەیەک لە ئاڤێستای پرسی مانگانە چەند پارە دەدا بە مۆم. ئاڤێستا پێکەنی و وەڵامی نەدایەوە. ئەو لە سوێدییەکانەوە فێربووە ئەوەندە مۆم بەکاربهێنێ. وڵاتەکەیان لە زستاندا ئەوەندە تاریکە، پێویستیان بە هێمنی ڕووناکییە. ڕووناکی مۆمەکان ئاسوودەیی بە ئاڤێستا دەبەخشێ. هێندەی نەبرد ڕۆبرت لە دەرگای دا. ئاڤێستا هێشتا فریا نەکەوتبوو خۆی بگۆڕی، جلەکانی بۆنی خواردنییان لێدەهات. خێرا دەریا ناردیە ژوورەکەی خۆی تا جلەکانی بگۆڕێ. ئاڤێستا ویستی بەگوێی نەکات کەچی وتی «دەی خێراکە جلەکانیشت هێندە جوان نییە، بەیانی ئەوەندە بە پەلە چوویتە ئیش هەر نەتزانی چیت لەبەر کرد، بیرت نەچێ تۆزێکیش ماکیاج بکەیت.»دەریا خۆی چوو دەرگاکەی کردەوە، وەک ژنێکی ماقوڵ بەخێرهاتنی ڕۆبەرتی کرد. قاپووتەکەی لێ وەرگرت و هەڵیواسی. بردیە هۆڵەکەو پێی وت بەمزوانە ئاڤێستا دێت. زۆر بە وردی لە ڕۆبـرت ورد دەبوویەوە، تەماشای هەموو جوڵانەوەیەکی دەکرد. ڕۆبرت نەیدەزانی چی لەگەڵ باسبکات، لەگەڵ ئەوەی خۆی دوو منداڵی هەبوو هەر لەو تەمەنەدا بوون. دەریا دەست پێشـخەری کرد و باسی قوتابخانەی بۆکرد. باسی

مامۆستاکانی بۆ کرد. باسی دوا ڕۆمانی بۆ کرد کە دەیخوێنێتەوە، ڕۆبرت بەلایەوە سەیربوو ئەو لەو تەمەنەدا ئەو ڕۆمانانە دەخوێنێتەوە. ڕۆبرت پرسی »کتێبەکانی ئاسترید لیندگرێنت خوێندووەتەوە؟». نەیزانی بۆ ئەو پرسیارەی لێی کرد. لەوانەیە لەبەرئەوەبێت منداڵەکانی زیاتر بەرهەمی ئەو نووسەرەیان دەخوێندەوە. دەریا بە پێکەنینەوە وتی «هەندێ لە کتێبەکانیم خوێندوەتەوە کە منداڵتربووم، بەڵام وا هەست دەکەم کتێبەکانی زۆر منداڵانەن.»ئەم قسەیەی زۆر بەلاوە سەیربوو، چونکە ئەم نووسەرە بەرهەمی بۆ تەمەنی جیاواز نووسیووە. بەڵام ئاخۆ ئەم کچە بچووکە مەبەستی لە منداڵانە چییە. لەو کاتەدا ئاڤێستا هات و خێراتنی ڕۆبرتی کرد، یەکترییان لە ئامێزگرت. ڕۆبرت وردبوویەوە لە ئاڤێستا، گۆڕانکارییەکی بینی. دەموچاوی گەشبووەتەوە، زیندووبوونەوە لە چاوەکانیدا دەبینی. سوراوێکی سووری تۆخی کردووە، ڕوومەتەکانی ئاڵکردووە. دەریا چووە موتبەخەکە و خۆی لەوێ خەریککرد. گوێشی لێیان گرتبوو. ڕۆبرت وتی «چی ڕوویداوە زۆر جوان بووی. بۆ زوو باسی ئەم قەیرە کچەت بۆ نەکردم، خۆ ئەوە لە منداڵ ناکات، زۆر سەیرە. وا دەزانی لەگەڵ پیرەژنێکی دنیادیدە قسە دەکەیت.»ڕاستی دەکرد، ئاڤێستا دەزانی قسەکانی هەمووی ڕاستن. بەڵام نەیویست لەوە زیاتر باسی دەریا بکەن. هێشتا وەختی نەهاتووە. دەریا خواردنەکەی خستە سەرمێزەکە و بانگی کردن. هەرسێکیان پێکەوە نانی ئێوارەیان خوارد. زیاتر باسی شتی گشتیان دەکرد. خۆیان لەباس کردنی شتە تایبەتیەکان لادەدا.

پاشان دەریا چووە ژوورەکەی خۆی و بەجێیهێشتن. ترسی ئەوەی هەبوو گەر ئاڤێستا شوو بە ڕۆبرت بکات، ئەمی لەبیربچێ و گوێی پێنەدا. دڵی خۆی دەدایەوە دەیگوت گرنگ نییە، گەر وابێت دەتوانم بچم

لەگەڵ ڕێزان یان هەتاودا بژیم. دڵنیام هەتاویش دەدۆزمەوە. ئیتر دەریا تا ڕۆبەرت نەڕۆشت نەهاتە هۆڵەکە. گوێی لێبوو کە ڕۆبەرت دەڕوات. خێرا چوو بۆ هۆڵەکەو بە ڕێزەوە خواحافیزی لێی کرد. ئەو ڕۆیشت، ئاڤێستا بە بزەیەکەوە ڕووی تێکرد و وتی «ها چی دەڵێت بەکەڵک دێت؟». دەریا بیرێکی کردەوە، چاوەکانی نوقاند و پاش ماوەیەک وتی «وابزانم پیاوێکی باشەو بەختەوەرت دەکات، ئەو تۆی زۆر خۆشدەوێت. هەموو شتێکت بۆ دەکات تا بەختەوەربیت. ئاڤێستا گەر دەتەوێ من دەتوانم لەگەڵ ڕێزاندا بژیم.»ئاڤێستا سەری سوورما لەم قسەیەی، نەیزانی بۆ ئەم قسەیە دەکات، لە کاتێکدا کە پەیوەندییان تا بێت بەرەو قوڵبوونەوە دەچێت. دەستی دەریای گرت و لەسەر قەنەفەی هۆڵەکە دانیشتن و وتی «وا مەزانە گەر من ژیانی هاوبەش لەگەڵ ڕۆبرت دەست پێبکەم واز لە تۆ دەهێنم. هەرگیز ئەمە ڕوونادات. تەنانەت گەر خۆشت حەز بکەیت لای ئەوان بژیت ڕێگەت پێنادەم. تێگەیشتی. ئەمڕۆ بۆ یەکەمین جار پێت وتم دایە. من بۆ یەک ڕۆژ نابم بە دایکت، بەڵکو تا مردن.». دەریا هێمن بوویەوە و سەری خستە سەر سنگی ئاڤێستا وتی «دەزانم شوودەکەی بە ڕۆبرت و سێ منداڵتان دەبێت. منیش دەبمە خوشکی گەورەی ئەوان. ئاگاداریان دەبم و جلەکانیان دەگۆڕم.». ئاڤێستا بەم قسەیەی زۆر دڵی خۆشبوو. باوەڕی نەدەکرد ئەو بتوانێ لەگەڵ پیاوێکدا بژی و شووی پێبکات و منداڵی ببێ. گەر واش نەبێت هەر خۆشە بڕوا بەو قسەیەی دەریا بکات.

پاش چەند ڕۆژێ ڕۆبرت و ئاڤێستا پێکەوە چوونە دەرەوە. دەریا ئەو ئێوارەیە چوو بۆ ماڵ ڕێزان. دەریا لەگەڵ ڕێزان هەموو ئێوارەکە پێکەوە دانیشتن و ڕێزان باسی هەموو ژیانی خۆیی بۆکرد. دەریا خۆزگەی دەخواست گەر دایکی تۆزێ ئازایەتی ڕێزانی دەبوو، گەر

وابوایە هەرگیز وای بەسەر نەدەهات. پەیوەندی ڕۆبرت و ئاڤێستا بەخێرایی با پەرەی دەسەند. ڕۆژانی شەممەو یەکشەممە پێکەوەبوون. ئەو جارانەی کە ئاڤێستا دەچووە لای ڕۆبرت، دەریا دەچووە ماڵ ڕێزان.

ئەو ئێوارەیە ڕۆبرت خواردنی ئامادەکردبوو، مێزەکەی ڕازاندبوویەوەو ماڵەکەی کردبوو بە گوڵ و ئاڤێستا ئاسا لەهەموو سوچێکی ماڵەکەدا مۆمی داگیرساندبوو. زیاتر لەدوو مانگە هەموو هەفتەیەک یەکتر دەبینن، زیاتر و زیاتر لە ڕووی ڕۆحیەوە بەیەکەوە دەبەسترێنەوە. لەگەڵ ئەوەی ئەو شەوانە لەسەر یەک جێگە دەخەوتن، کەچی لە باوەش و ماچی شەوباش زیاتر هیچ لە نێوانیاندا ڕووی نەدەدا. هەتا ئەو ئێوارەیە ئاڤێستا هیچ شتێکی دەربارەی ژیانی خۆی بۆ ڕۆبەرت باس نەکردبوو. لە باس کردنی ڕاستییەکان دەترسا. نەیدەزانی کاردانەوەی ئەو چی دەبێت. بڕوای بەو خۆشەویستییە ڕۆحیە هەبوو لە نێوانیاندا، گەیشتە ئەو باوەڕەی کاتی ئەوە هاتووە ئەو نهێنییەی بۆ بدرکێنێ کە هەموو ڕەوتی ژیانی گۆڕی.

پاش نانی ئێوارە، ڕۆبرت ئاڤێستای کردە باوەشەوەو بردیە هۆڵەکە. ئاڤێستاش پێدەکەنی و دەیویست دایبنێتەوە. لەسەر قەنەفەی هۆڵەکە داینا و لە بەردەمیدا لەسەر ئەژنۆ دانیشت و وتی «ئاڤێستا ڕازی دەبیت ببیت بەژنی ئێستاو داهاتووم». ئاڤێستا سەری سوڕما و بڕوای نەکرد، ئەم دیمەنەی تەنیا لە فیلمەکاندا بینییوە. سەیری ئەوی دەکرد و نەیدەزانی چی بڵێ.»تکایە تەنیا گوێ لە دەنگی دڵت بگرە، بزانە ئەو چیت پێ دەڵێ. سەیرم کە، بیر لەهیچ مەکەرەوە تەنیا گوێ لە دڵت بگرە، دەتەوێ ئەوەی ماومانە لەم ژیانەدا پێکەوە بەسەری ببەین؟.».

فرمێسکەکانی هاتنە خوارەوە وەک هەموو جارێ. باوەشی بە ڕۆبەرتدا کرد و بە گوێدا چرپاندی»بەڵی دەمـەوێ هەموو ژیانم لەگەڵ تۆدا بەسەربەرم. تەنیا مردن لێکمان جیا دەکاتەوە. لە ئامێزم بگرە، توند توند لە ئامێزم بگرە.»

ئەوجا ڕۆبرت ئەو ئەڵقەیەی کە بۆی کڕیبوو لە گیرفانی دەریهێنا و کردیە پەنجەی. بە ترسەوە ماچی گۆنای کرد. پەنجەکانی خستە ناو قژییەوە و پاشان بە هێمنی لە ئامێزی گرت و توند نووساندی بە خۆیەوە و بەری نەدەدا. لەهەمان کاتدا ترسی ئەوەشی هەبوو وەک ئەو شەوە لە دەستی ڕابکات. بۆیە زۆر بەهێمنی و بە بیرکردنەوەوە دەستەکانی دەجوڵاند و ماچی لێوانی دەکرد. ئەمجارەیان لە باوەشی گرت و بردیە ژووری نووستنەکە. کە دەستی برد بۆ ڕوومەتی هەستی کرد فرمێسکەکانی بە خوڕ دێنە خوارەوە. ڕۆبرت دەیزانی دەیەوێ شتێکی بۆ باسبکات. بۆیە سەری خستە سەر سنگی و گوێی بۆ ترپەی دڵی دەگرت وتی «گوێم لێتە دەزانم دەتەوێ باسی شتێکم بۆ بکەی. گەر دەزانی باس کردنەکە یارمەتیت دەدات باسی بکە، گەر ناتەوێ ئەوە ئازادی. تەنیا یەک شت بزانە ئەوەی پێشتر لە ژیانی تۆدا ڕووی داوە تۆزقاڵێ کارناکاتە سەر خۆشەویستی من بۆ تۆ. ژیانی من و تۆ لە ئێستاوە دەست پێدەکات.». ئاڤێستا هەستی بە دڵنیایی کرد. فرمێسکەکانی سڕییەوە سەری بەرزکردەوەو لە ماوەی ئەو شەوەدا ئەوەی بەسەری هاتبوو بە درێژیی هەمووی بۆ باس کرد. شەوەکە زۆر بە خێرایی تێپەڕبوو. نەیانزانی کەی خەویان لێکەوت. بۆ ڕۆژی دوایی نزیکەی سەعات چواری پاش نیوەڕۆ خەبەریان بوویەوە. ئاڤێستا چاوەکانی کردەوەو هەستی کرد، ئاڤێستایەکی ترە، لە ئاڤێستای دوێنێ شەو ناکات. ئا لەو کاتەدا ڕۆبرتیش خەبەری بوویەوە. خۆی خزانە

باوەشیەوەو توند ڕۆبەرتی بەخۆیەوە نووساند. هەستی کرد هیچ سنوورێک لێکیان جیا ناکاتەوە، هەناسەیان یەکەو بۆنی جەستەیان هەمان بۆنە. جلەکانیان لەبەر یەک داکەندو لەسەر ئاوازی سروشت تێکەڵ بەیەکبوون. ئەو ڕۆژەیان لە ژووری نووستنەکە بردە سەر. ئاڤێستا پەردەی پەنجەرەکەی لابرد، بینی دنیا تاریکبووە. سەیری سەعاتی کرد دەی شەوە. هەردووکیان ئەو ڕۆژە هیچیان نەخواردووە. خواردنەکەی دوێنیان گەرمکردەوەو خواردیان.

من هیچ وشەیەک شک نابەم بۆ وەسفکردنی ئەو بەختەوەرییەی لە ترپەی دڵی ئەو دوو مرۆڤەدا دەبیسترا. هەستت بە قورسایی جەستەیان نەدەکرد، بەڵکو وەک دەسماڵێکی ئاوریشمی پەمەیی بەدەم شنەی شەماڵەوە بەوماڵەدا دەهاتن و دەچوون. باسی خۆشەویستی کەسەکانی ئەم ڕۆمانەم بۆ کردن. بەڵام لە هیچ یەکێ لەو پەیوەندییانەدا تێکەڵبوونێکی ڕۆحی لەم چەشنەم نەدی. خۆشەویستی ئەمان شێوەی کامڵبوونی ڕۆح و جەستەو هۆشی گرتەوە. هەربۆیە هەموو ئەو گرفتانەی لە حاڵەتەکانی تردا دەبوونە دیوار لەبەردەم گەیشتنی خۆشەویستەکان بەیەکتر، لێرەدا و لەم پەیوەندییەدا هیچ ڕۆڵێکی نەبوو. هەردووکیان توانییان بەسەر هەموو دیوار و بەربەستەکاندا بازبدەن و بۆ هەتا هەتایە لەئامێزی یەکتردا ئارامبگرن.

هەتاو حەزی بەگەڕانەوە نەدەکرد. هەستی بەوونبوونی خۆی دەکرد، لەلایەک خۆشەویستی هانس لەناو دڵییدا زیندوو بوو. لەلایەکی ترەوە نەیدەزانی چی لەخۆشەویستی بێ سنووری نەورۆز بکات. گەر نەگەڕێتەوە ژیانی هانسی کوڕی چۆن دەبێت. ئالەم کاتەدا هانسی کوڕی و نەورۆز هاتنە ژوورەوە. وەک هەموو جارێ هەریەکەیان دەستێکیان گرت و هەردووکیان دەستیان ماچکرد و پاشان ئەملاوئەولایان ماچکرد. ئەو ڕۆژە بیرییان چووبوو دەفتەری یادەوەرییەکانی هەتاو بهێنن. بۆیە نەورۆز بڕیاری دا ئەو ئێوارەیە پێکەوە گۆرانی بڵێن. هەردووکیان دەیانزانی هەتاو زۆر حەزی لە گۆرانییەکانی بەهجەت یەحیایە. هانس خێرا بیری کەوتەوە کە دایکی حەزی لە گۆرانی دایەیە. ئەو زۆر جار بە شەوان گوێی لەو گۆرانییە دەگرت. نە هانس نە نەورۆز وشەکانی ئەو گۆرانییە بەباشی نازانن. پاشان هانس وشەی ئەو گۆرانییەی بیرکەوتەوە کە لەگەڵ دایکیدا دەیگوت:

لەو دیو سنووری تەریقەتەوە تۆ دەپەرستم شەیدایی وایە،
بێ باکم لەوەی خوێنم حەڵاڵ کەن
کوا عاشقی ڕاستگۆیێ لە دنیایە.
منیش مەنسوورم، ئەم ڕێیە دەگرم،
ڕێگای بەرەو تۆ بۆ من بڕوایە،
جاڕی فیدابوون ئەمجار من دەیدەم،
چونکە مەعبوودم لە ناو دڵمایە.
بانگی عەشق دەدەم تا دوا هەناسەم
چونکە عەشق پاکە و پیرۆزی تیایە.
فەنابووم لە ناو دنیای ئەڤینا،
کەچی پێم وایە هەر سەرەتایە.

من له پەروانه فێری ئەڤین بووم
هەتاکوو سووتان ڕووم له چرایه،
چۆن سوجده بەرێت بۆ عەشقێکی تر،
که باڵای عەشقی تۆ له هەورایه.

ئا لەو کاتەدا هەتاو بزەیەک گرتی و هەردووکیان له خۆشیدا باوەشیان بە یەکترداکرد و پاشان باوەشیان بە هەتاودا کرد. هەردووکیان دەستی یەکتریان گرت و له ژوورەکـەدا هەڵدەپەرین. ئالەو کاتەدا پیاوێکی بچکۆلەی ورگ زل خۆی کرد بە ژووردا و تەماشایەکی هەتاوی کرد تەماشایەکی نەورۆزی کرد. له چاوترۆکانێدا دەمانچەکەی دەرهێناو ڕوویکردە هەتاو. نـەورۆز هەر هێندە فریا کـەوت خۆی خستە بەر لوولەی دەمانچەکەی و نەورۆز گوولەکانی بەرکەوت و ئەو کابرایەش لەچاوتروکانێکدا ڕایکردە دەرەوە. دەنگی تەقەکەو ڕاکردنی ئەو کابرایە هەموو ئەوانەی لەو ناوە بوون شڵەژاند. هانس بێ لاکردنەوە له نەورۆز بەدوای ئەو پیاوەدا ڕایکرد، هاواری کرد، دەی بیگرن. هەندێ ڕایانکردە ژوورەکەی هەتاو و هەندێکی تریان بەدوای ئەو کابرایەدا ڕایان دەکرد. هانس تا دەهات هەنگاوەکانی خێراتر دەکرد و نەیدەویست لێی وونبێت کەچی کەس ئەوی بۆ نەدەگیرا. لەبەردەم دەرگای خەستەخانەکەدا دوو پاسـەوان وەستابوون، هانس هـاواری بۆیان کرد وتی: بیگرن، ئەو دایکمی کوشتووە. ئا لەو کاتەدا ئەو کابرایە دوا بەدوا گەڕایەوەو فرسەتی هێنا و پەلی هانسی گرت و پەلکێشی لای خۆیی کرد. ڕووی دەمانچەکەی کردە سەری هانس. هاواری کرد «گەر نزیکم بکەونەوە، گوللەیەک دەنێم بەسـەری ئـەم کـوڕەوە». وردە وردە بـەرەو لای دەرگاکە دەڕۆیشت. بە ئاگادارییەوە بەرەو سەیارەکەی دەڕۆیشت و توند دەستی هانسی گرتبوو. چەند جارێکیش بۆ چاوترساندنی خەڵکی ئەو ناوە چەند فیشەکێکی بە ئاسماندا تەقاند. هەر کە گەیشتە لای

سەیارەکەی، دەرگاکەی بۆ کردەوەو خۆشی چووە ناو سەیارەکە و پێی نا بە بەنزیندا. ئەو گێلە نەیدەزانی ئەمە شارێکی زۆر بچکۆلەیە و وابە ئاسانی ناتوانێ لە دەست پۆلیس ڕزگاری ببێت. ئا لەو کاتەدا ئەو دوو پاسەوانە توانیان ژمارەی سەیارەکەی بنووسن.

زیاتر لە دە کەس لە دەوری نەورۆز کۆببوونەوە. کەس ئاگای لە هەتاو نەبوو، چوارمشقی لەسەر قەرویلەکە دانیشتبوو. لە ناکاوا هەموو وایەرو سۆندەکانی لەخۆی کردەوەو ڕایکرد دەرەوەو هاواری کرد هانس... هانس. ئەوانەی ژوورەکە بینیان هەتاو هاتووەتە هۆش خۆی. بەڵام کەس کاتی ئەوەی نەبوو، بەدوایدا ڕابکات، چونکە باری تەندروستی نەورۆز لە مەترسییدا بوو. خێرا ژووری نەشتەرگەرییان بۆ ئامادەکرد. بەرەو ئەوێیان برد. هەتاویش وەک شێت ڕایدەکرد. هەتا دوو پەرسدار ناسییانەوەو گرتییان و هەوڵییان دا نەیەڵن بچێتە دەرەوە. ئەویش هەر هاواری هانسی دەکرد. هێندەی نەبرد پۆلیس هەموو نەخۆشخانەکەی گرت. تا ئەوان هاتن، ئەو کابرایە سواری سەیارەکەی ببوو و هانسی لەگەڵ خۆیدا بردبوو.
پۆلیس بە ئاسانی شوێنی سەیارەکەیان دۆزیـوە. پۆلیس دەوری سەیارەکەیان دا و داوایـان لێی کرد هانس بنێریتە دەرەوە. لە ناو سەیارەکەدا مایەوە و نەهاتە دەرەوە، هەر لەناو سەیارەکەیدا مایەوە و دەمانچەکەی لەسەر سەری هانس دانابوو. پۆلیسێکی زۆر ئەو ناوەیان گرتبوو. هەموو تواناو ئەزموونەکانیان خستبووە کار بۆ ڕزگارکردنی هانس. لەهەمان کاتدا کۆمەڵێ کامێرای تەلەڤزیۆنی و ڕۆژنامەکان لەو ناوە کۆببوونەوەو چاوەڕوانی گۆڕانکارییەکیان دەکرد. هانسیش بە کوڵ دەگریا و نەیزانی دایکی چی بەسەرهاتووە. وێنەی نەورۆزی لە پێش چاوە چۆن کەوتە سەر زەوییەکە. نازانێ دایکی هیچ فیشەکی

بەرکەوتووە. بیری کەوتەو کە ئەو لە ژوورەوە بوو نزیکەی شەش تەقەی کرد. لە دەرەوەش بوون زیاتر لە شەش تەقەی تری بە ئاسماندا کرد، لە دڵی خۆیدا پرسی ئاخۆ ئەو دەمانچەیە چەند فیشەکی تێدا بێت. هەوڵی دا بیری بکەوێتەوە. چونکە نەورۆز زۆر باسی ئەو چەکانەی بۆ دەکرد کاتی ئەو پێشمەرگە بووەو بەکاری هێناون. بۆیە لەو باوەڕەدا بوو هیچ فیشەک لە دەمانچەکەیدا نەماوە. بۆیە پەلاماری دا و وتی ها گەر ئازای بمکوژە. خۆ تۆ تازە دایکمت کوشت. ئەویش دەمانچەکەی خستە سەر سەری هانس. ئا لەو کاتەدا پۆلیس ناچاربوو، کارێک بکات. تەقە کراو فیشەکێک بەر شانی ئەو پیاوە کەوت. لە ئەنجامی شکاندنی شووشەی پەنجەرەکە دەمووچای هانسیش هەمووی بریندار ببوو. هانس ئەو ئازایەتییەی لە خۆیدا شک برد و لەو کاتەی کە زرمەیان لەو کابرایە هەستاند، دەرگای سەیارەکە بکاتەوەو ڕاکاتە دەرەوە. خێرا ئەویان خستە ناو سەیارەی فریاکەوتنەوەو بەرەو نەخۆشخانەیان برد.

لەولاشەوە هەتاو لە شوێنی خۆی نەدەجوڵاو هەموو ئەوانەی لە دەوری بوون، چاریان نەدەکرد و نەیاندەتوانی بیبەنە ژوورەوە. هێمنیان کردەوەو پێیان ڕاگەیاند کە کوڕەکەی سەلامەتەو بەرێگەوەیە بۆ نەخۆشخانەکە. کە هانسی بینی و هەموو دەموچاوی خوێنە، بە هەموو هێزی هاواری کرد «هانس ... هانس»ئا لەو کاتەدا کامێرای تەلەڤزیۆن و ڕۆژنامەنووسەکانی سەرقاڵی وێنەگرتن و وەرگرتنی ڕاپۆرت بوون. هەرچەندە پۆلیس هەوڵی دەدا خەڵکەکە دوور خاتەوە لەو ناوە. هەتاویان دڵنیا کردەوە، کە کوڕەکەی سەلامەتە. تەنیا پارچەی شووشەی بەرکەوتووە. هانس کە دایکی بینی لە بەردەرگای نەخۆشخانەکەدا وەستاوە و بەهەموو هێزی بەرەو ڕووی ڕایکردو

یەکترییان لە ئامێزگرت. هانس خێرا هەواڵی نەورۆزی پرسی. دەرکەوت هەتاو ئاگای لە نەورۆز نییە. هەر ئەوەندە دەزانێ بەسەر هەندێ خەڵکدا بازی دا و بەرەو دەرەوە ڕایکرد. هەردووکیان دەستی یەکترییان گرت و بەرەو ژوورەکەی خۆیان ڕۆیشتن. چەند پزیشکێ هاتنە ژوورە، خەریکی هانس بوون و هەروا داوایان لە هەتاو کرد بچێتەوە سەر جێگەکەی خۆی تا بزانن باری تەندروستی چۆنە. هانس خێرا هەواڵی نەورۆزی پرسی. نەورۆز براوەتە ژووری نەشتەرگەری، باری تەندروستی باش نییەو جارێ نازانن چۆن دەبێت. هانس دەستی کرد بەگریان. خێرا دایکی هێمنی کردەوە. جارێ هەتاو ناتوانێ ڕووداوەکان جیابکاتەوە. پێش ماوەیەکی کورت ئەو لە جیهانێکی تردا بووە. ناوی ئۆلگا ناوێک بە مێشکیدا هات. لە هانسی پرسی »ئەرێ ئۆلگا ناوێک لێرە نەبووە.»هانس تەنیا سەری ڕاوەشاند و قسەی نەکرد. پاشان پرسی «ئەی نەورۆز چی بەسەرهاتووە؟». هانس بۆی ڕوونکردەوە کە پیاوێک هاتە ژووەوەو ویستی تەقە بکات، وابزانم دەیویست تەقە لە تۆ بکات. نەورۆزیش خۆی دا بەسەر تۆدا و فیشەکەکان بەر ئەو کەوتن. خێرا هەتاو ڕایکردە دەرەوەو وتی «نەورۆز لە کوێیە، نەورۆز لە کوێیە؟»بە زۆر دەستیان گرت و هێنایانەوە ژوورەو بەڵێنیان پێدا گەر هەرچ شتێکی تازە بێت ئاگاداری دەکەنەوە. حەبی هێمن کەرەوەیان بۆ هێنا. پاش ئەوەی دەموچاوی هانسیان پاککردەوە، هەتاو زیاتر هێمن بوویەوە. ئەو کاتە دوو پۆلیس هاتنە ژوورەو هەتاوییان ئاگادار کردەوە، ئەو پیاوە گیراوەو زانییان کێیە. وتیان»مێردەکەی پێشووتە«. هانس کە گوێی لەم قسەیە بوو حەپەساو چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسک و ڕووی کردە دایکی وتی «باوکی من ئەو کارەی کردووە، باوکی من کەسێکی وا خراپبووە، ئەی تۆ بۆ ئەتووت زۆر یەکتریتان خۆش ویستووە. ئەمە بۆیە نەتدەویست بیناسم». هەتاو هانسی نا بە سنگییەوە بۆی باس کرد

که ئەمه باوکی ئەو نییه، بەڵکو مێردی یەکەمیەتی. ئەو شووی بە باوکی ئەم نەکرد. هانس هەموو شتەکانی لێ تێکەڵ و پێکەڵبوو. نەیدەتوانی هیچ بڵێ و هەر فرمێسک بە چاوانیدا دەهاتە خوارەوە. لەناکاوا ڕایکردو چووە دەرەوە وتی دەچم بۆ لای نەورۆز. هەتاویش هەستاو دوای هانس کەوت. بەرەو ژووری نەشتەرگەرییەکە چوون. هەتاو کون و کەلەبەری نەخۆشخانەکە شارەزابوو. چونکە ماوەیەک لەم خەستەخانەیەدا کاری کردووە. پێیان ڕاگەیاندن هێشتا نەشتەرگەرییەکە تەواو نەبووە. ئەو ماوەیە هانس نەدەهات بەلای دایکیدا و نەیدەویست بچێتە باوەشی و سەیری نەدەکرد. هەتاو دەیزانی منداڵێکی وەک ئەو بە خێرایی ناتوانێ لە هەموو گرێ کوێرەکان بگات. پاش چوار سەعات نەورۆزیان هێنایە دەرەوەو دکتۆرەکە وتی توانیوویانە فیشەکەکان دەربهێنن. بەڵام لەوە دڵنیا نین گەر گورچیلەکانی بکەونەوە کار. نەورۆزیان بردە ژوورێک و لە ژێر چاودێری تایبەتیدا بوو. داوایان لە هەتاو و هانس کرد کە بچنەوە ژوورەکەی خۆیان و جێگەیەکیان بۆ هانس هێنا، تا ئەو شەوە لەوێ بخەوێ. لەسەر جێگەکە پاڵکەوت و ڕووی لە دایکی وەرگێڕا و بێدەنگ بوو. دایکیشی وەک ئەو شتەکانی لێ تێکەڵاو ببوو. لەلایەکەوە چۆن ئەم کابرایە ئەمی دۆزیووەتەوە پاش ئەم هەموو ساڵە، نیگەرانە و نایەوێ نەورۆز هیچی لێبێت، ناوی ئۆڵگا لە گوێیدا دەزرنگێتەوەو نازانێ ئەم ناوە لە کوێوە هاتووە. ترسی ئەوەشی هەیە، وێنەی ئەم لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوبکرێتەوەو هانس بزانێ ئەم لە کوێیە.

هەر ئەو ئێوارەیە هەموو ڕۆژنامەو کەناڵەکانی تەلەڤزیۆن ئەم هەواڵەیان پەخش کردەوە. هەر ئەو ئێوارەیە ڕێزان تەلەڤزیۆنەکەی کردەوەو خستییە سەر کەناڵی دوو، دەنگوباس بوو. ئەو کەم گوێی لە دەنگوباس دەگرت و دەیوت کە سەیری ئەم هەموو کارەساتانەی دنیا دەکەی

مەزاجت تێکدەچێ. ئەو ئێوارەیە لەسەر دەنگوباس دانیا، بەبێ ئەوەی گوێ بگرێ. لە ناکاوا وێنەی هەتاوی بینی. لە شوێنی خۆی ڕاپەڕی و پەلاماری تەلەفۆنەکەی دا تەلەفۆنی بۆ ئاڤێستا کرد. بێ سڵاوکردن، بە شڵەژاوی وتی «بیخەرە سەر کەناڵی دوو، با دەریا سەیری بکات.»لە مەسەلەکە نەگەیشت، چی ڕوویداوە. ئەو منداڵە کێبوو، هات باوەشی بە هەتاودا کرد. بڵێی شوویەکی تری نەکردبێت لەوانەشە، هەربۆیە هانس بە دوایدا نەگەڕا. زۆر بە فەقیرم دەزانی لەوە ناکات وابێت. بڕوا ناکەم. ئەم بیرۆکانەو چەندانی تر بە مێشکی ڕێزاندا تێدەپەڕین. دەریا تەلەفۆنی کرد. ئەویش ئەوەندە لە دەنگوباسەکە تێنەگەیشت. بەڵام لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە لەسەر ئەو هەواڵەی خوێندەوە. ڕیزانی لە درێژەی هەواڵەکان ئاگادارکردەوە. ڕێزان دەستی کرد بە گریان و وتی هەر سبەی دەبێت بچین بۆلای. ئاڤێستا هێمنی کردەوەو وتی «زۆر زەحمەتە سبەی ئەو کارە بکەین، دەبێت مۆڵەت لە قوتابخانە وەرگرین. بەم پەلە پەلە ئەم کارە سەرناگرێ.»ئاڤێستا. ڕێزان و دەریای هێمن کردەوە. ئەو شارەشی کە هەتاوی تێدا دەژێت نزیکەی پێنج سەعات لەمانەوە دوورەو کەوتۆتە باکووری سوید. بۆ ڕۆژی دوایش هانس ئەم هەواڵەی لە ڕۆژنامەدا خوێندەوەو خێرا بە وێنەکەدا هەتاوی ناسییەوە. هەمان ئێوارە سارا لە تەلەڤزیۆندا گوێی لە هەواڵەکە بوو ، نیگەرانییەکی زۆر دەروونی داگیرکرد. بەڵام هیچ دەستەڵاتێکی نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێت هیوای ئەوە بخوازێ هانس ئەم هەواڵە نەبیستێ. هەر ئەو ڕۆژە پاش کار هانس سواری سەیارەکەی بوو، بەرەو ئەو شارە ڕۆیشت.

باری تەندروستی نەورۆز بەرەو خراپی دەڕۆیشت، یەکێ لە گورچیلەکانی دەرهێنرابوو، ئەوی کەشی لەکار کەوت. هەتاو بڕیاری دا گورچیلەیەکی خۆیی بداتێ. بێ نەورۆزی بە هەردووکیانەوە دیاربوو.

هەردووکیان کزکز لەبەردەم ژوورەکەی نەورۆز دانیشتبوون. هانس لە دایکی زیاتر نیگەران بوو. ئەو ماوەیەی کە دایکی لە نەخۆشخانە کەوتبوو تەواو هۆگری نەورۆز ببوو. نەورۆز نەیدەهێشت بێزار ببێت. باسی ڕۆژانی پێشمەرگایەتی بۆ دەکرد. ئەو جیهانە بۆ هانس تازە بوو. بۆیە بە وردی گوێی بۆ دەگرت. جارێکیان کە پێکەوە چوون بۆ مەلە. هانس قوڵاییەکی لە سکی نەورۆزدا بینی. پرسی»ئەوە چییە. بۆ وایە؟». نەورۆزیش زۆر حەزی لێبوو باسی پێشمەرگایەتی بکات. بەردەوامیش شانازی بەو کاتەوە دەکات کە لە شاخ بووە. نەورۆز یەکێک بووە لە پێشمەرگە ئازاکانی ناوچەی گەرمیان. بەردەوامیش لە شەڕەکاندا لە پێش هەموویانەوە بووە، تەنانەت گەر لە هێڵی پێشەوەی شەڕ نەبووایە، ئەوا هەر خۆی دەگەیاندە هێڵی پێشەوە. لە یەکێ لەو شەڕانەدا بریندار دەبێت، گوللەیەک بەر لای ڕاستی سکی دەکەوێت. هەست بە ئازار و گەرمییەک دەکات. کە دەست دەبات بۆ سکی، لە ژێر پشتوێنەکەیەوە، خوێن بە قوڵپ دێتە دەرەوە. هەوڵدەدا ئەمە ئاشکرا نەکات. تا لە شەڕەکەدا بەردەوام بێت. یەکێ لەو پێشمەرگانەی کە لە نزیکییەوە دەیبینێ، خێرا دووری دەخاتەوە لە هێڵی پێشەوە. هاوڕێیەکی فیشەکلەخەکەی لێدەکاتەوەو پشتێنەکەشی دەکاتەوە. پشتوێنەکەی گرمۆڵە دەکات و دەیخاتە سەر برینەکەی تا خوێنەکە بوەستێ. بە پەلە دەیگوێزنەوە. دوو پێشمەرگە دەچنە ژێر باڵی و هەوڵدەدەن بەرەو نزیکترین بنکەی ببەن. هەرچۆنێ بێت وڵاخێ پەیدادەکەن و دەیخەنە سەرپشتی. ئازار تەنگی پێهەڵدەچنێ. دان بەخۆیدا دەگرێ. زۆر جار بۆ ساتێ لەهۆش خۆی دەچێت و دیسانەوە هۆشی دێتەوە سەرخۆی. خۆشی نازانێ لە هۆشی خۆی دەچێت یان بەرەو دنیایەکی تر دەڕوات. لەو گوندە پزیشکی پێشمەرگەی لێنەبوو. ئەمیش هەتا بێت هێزی تێدا نامێنێت. دەستێکی بەسەر برینەکەیەوەیەتی تا خوێنەکەی بوەستێتەوە.

هەندێ جاریش دەستی هێندە بێهێز دەبێت کە ناتوانی فشار بخاتە سەر برینەکەی. لەو گوندە بریندارێکی تریش هەیە. تراکتۆرێ پەیدا دەکەن. ئەو بریندارەی تر باری لەم خەتەرترە، بۆیە دەڵێت با ئەو لە پێشەوە سوار بێت، ئەمیش خۆی لە پشتەوە پاڵدەکەوێت. هەتا دەگەنە گوندەکەی تر دەیان جار مەرگ بە چاوان دەبینێت. لە هەموو هەڵبەز و دابەزێکی ئەو تراکتۆرەدا ئەم لە تاو ئازار بەرەو ئاسمان دەفڕێ و دەنیشێتەوە. ئا لەو ساتانەدا دەموچاوی دایکی دێتە پێش چاو، خەمی دایکی دەبێت گەر ئەم بەرگەی ئەم ئازارە نەگرێ و شەهید ببێ دایکی چی لێدێت. لەبەر خەمەکانی دایکی نایەوێ بمرێ، دەبێت بەرگری بکات و خۆراگر بێت. دەموچاوی هەتاوی هاتەپێش چاو. ئەویشم ماوە. نابێت بمرم تا خۆشەوسیتی خۆمی بۆ نەدرکێنم. ئیتر ئاگای لەخۆی نەما. نازانێ چی بەسەرهات. کە چاوی کردەوە دکتۆرەکە پێی وت»هەر باشبوو زوو فریا کەوتین، فیشکەکەمان لە سکتدا دەرهێناو برینەکەمان دورییەوە. ماوەیەک دەبێت لێرە بمێنیتەوە، دەبێت پشوو بدەیت چونکە خوێنێکی زۆرت لێ ڕۆیشتووە. ئێستا وا جارێکی تر سکی بەر گوللە کەوت و خوێنێکی زۆری لێ ڕۆیشتووە. بەڵام ئەمجارە برینەکەی سەخت ترە. هانس ئەم قسانەی نەورۆزی هاتەوە یاد دەستی کردە گریان و باوەشی بە دایکیدا کرد و وتی «نامەوێ نەورۆز بمرێ، نامەوێ، ئەو جارێکی تریش بریندار بووە. خۆی بۆی باس کردم.»هەتاو نووساندی بە سنگییەوە و دڵنیای کرد کە نایەڵی بمرێ.

ئەو شەوە هەردووکیان خەویان لێنەدەکەوت. هەتاو داوای لە هانس کرد بێتە لایەوە، بەڵکو پێکەوە خەویان لێبکەوێت. هانس هێشتا وەڵامی ئەو پرسیارانەی لە دایکی گوێ لێنەبوو کە دوێنێ لێی کرد. نە هەتاو ئەو هێزەی تێدا بوو، نە هانسیش هێندە بەلایەوە گرنگ بوو. ئەوەی

بیری خەریککردبوو تەندروستی نــەورۆز بـوو. بەیانی خەبەریان بوویەوە، هەردووکیان پێکەوە ڕایانکردە لای نـەورۆز. تەندروستی تا ڕادەیــەک جێگیربوو. لەهەمان کاتدا بە هەتاوییان وت ئەنجامی پشکنینەکان هاتووەتەوە و دەتوانێ گورچیلەیەکی خۆی بداتێ. بەڵام ئەم نەشتەرگەرییە لە ستۆکهۆڵم دەکرێ. چاوەڕوانی هەواڵی ئەوێ دەکەن. هەر کە وەڵامیان بۆ هاتەوە بە هێلیکۆپتەری تایبەت دەیان گوێزنەوە. هەتاو زۆر دڵیخۆشبوو. هانس هەستی بە نیگەرانی دەکـرد، دایکی یەک گوورچیلەی دەبێت. گەر ئەمەش نەکات ژیانی نەورۆز دەکەوێتە مەترسییەوە. لەهەمان کاتدا شانازی بە دایکییەوە دەکرد. هەردووکیان چوون نانی بەیانی بخۆن. چوونە چێشتخانەکەی نەخۆشخانەکە. نانیان دەخوارد. هانس بەردەوام باسی نەورۆزی دەکرد. ئەو ماوەیەی کە پێکەوە بوون، زۆر لەیەک نزیک بوونەتەوە . ئا لەو کاتەدا هەتاو چاوی بەرزکردەوەو بینی هانس بەرەو ڕوویان دێت. بەبێ ئەوەی لە شوێنی خۆی بجوڵی، بە هانسی وت»تەماشاکە، ئەو پیاوەی بەرەو ڕوومان دێت و قاپوتێکی شینی لەبەردایە، باوکتە.»هانس حەپەسا و لایکردەوە، چاوی کەوتە سەرباوکی. بەبێ ویستی خۆی هەستا و بەرەو ڕووی ڕایکردو هاواری کرد «بابە... بابە». هاوارەکەی سەرنجی ئەوانەی بەلای خۆیدا ڕاکێشا کە لەوێ دانیشتبوون. هانسیش لە هیچ تێنەگەیشت و نەیزانی چۆن باوەشی بۆ کوڕەکەی کردەوەو توند لە ئامێزی گرت. هانس وتی «بابە، هەردەمزانی ڕۆژێک دێت بۆ لام، دەمزانی کە دەمدۆزیتەوە، من بـەردەوام بیرم لێت دەکـردەوە بابە.»هەتاو لە جێگەی خۆی نەجوڵا، هۆشی لای خۆی نەما و فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە لە دڵی خۆیدا وتی ئەمە ئەو هانسەیە کە ئەم هەموو ساڵە بە خەیاڵی ئامێز و گەرمییەکەی ئەو دەژییتم، ئەوەتا لەبەردەممدایە، کەچی یەک تۆزقاڵ هەستم ناجوڵێنێ. ئەمە ئەو هانسە نییە کە من خۆشمویست. نا ئەمە

یەکێکی ترە.»هانس بە گەرمی هاتە پێشەوە لێی، ئەم هەر دەستی برد و تا تەوقەی لەگەڵدا بکات، بەڵام هانس توند باوەشی پێدا کرد. ئەو ڕۆژە هەموو پێکەوە بوون. بە کورتی هەندێ شتیان باس کرد. بەڵام هەتاو بیری هەر لای نەورۆز بوو.

بۆ ڕۆژی دوایی بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکە بردنیانن بۆ ستۆکهۆڵم. هەر ئەو ڕۆژەش ڕێزان و دەریا و ئاڤێستا گەیشتنە خەستەخانە وبۆیان دەرکەوت بەیانییەکەی ئەوان بە فڕۆکە براون بۆ ستۆکهۆڵم. بەڵام لە نەخۆشخانە ئەو زانیارییەی کە ڕێزان مەبەستی بوو پێیان نەوتن. ڕێزان هەموو ڕێگەکە ماخۆڵانی پێکەوتبوو، ئەو هاوکێشەیەی بۆ شینەدەکرایەوە. کاتیش نەدەڕۆیشت. هەر بۆڵەی بوو بەسەر ئاڤێستادا و دەیگوت گەر دوێنی بهاتینایە فریایان دەکەوتین. دەریایش پێدەکەنی و دەیگوت»خەمت نەبێت هەر پێیان دەگەی. خۆ لە دەستمان ڕاناکەن». منداڵەکان دەیانویست لە شوێنێک بووەستن تا نانێ بخۆن و پشوویەک بدەن. بەڵام ڕێزان ڕازی نەدەبوو. ئاڤێستا گوێی بە ڕێزان نەداو لە ڕێسترانێک سەیارەکەی وەستاندو چوونە ژوورەوە. ماوەیەک ڕێزان لەناو سەیارەکە مایەوەو وەک منداڵ مانی گرتبوو. ئەوانیش گوێیان نەدایە. ئەویش ناچار چوو بۆ لایان.

هەتاو و نەورۆز لە یەک ژووردا و هەریەکە لەسەر سیستەمێک، هەر یەکە کۆمەڵێ وایەورو سۆندەیان پێوە بوو. هەتاو پێش نەورۆز خەبەری بوویەوە. پەرستارەکە لە ژوورەکەدا وەستابوو، هاتە پێشەوە لێی وتی «نەشتەرگەرییەکە سەرکەوتوو بوو، نەورۆز زۆر بێهێزە، لەبەر ئەو هەموو خوێنەی لێی ڕۆیشتووە. ئەمڕۆ خوێنی تێدەکەین. ماوەیەکی دەوێ تا هۆشی دێتەوە سەرخۆی. خەمت نەبێت وەک

جارانی لێدێتەوە.»

هەتاو ویستی هەستێ، پەرسدارەکە داوای لێی کرد نەجوڵێ، جارێ زووە. ویستی بەسەرلادا پاڵکەوێت، تا ڕووی لە نەورۆز بێت. نەیتوانی ئەوەش بکات. ئەوجا لایکردە نەورۆز و نەیدەویست چاوی لێبتروکێنێ. هەموو ساڵانی کۆلێژی بیرکەوتەوە. ئەو کاتەی بیر کەوتەوە کە ئەو پێشمەرگە بوو. چۆن هەموو شەوێ کە دەخەوت لە خودا دەپاڕایەوە بیپارێزێ. ئەو ڕۆژەی بیرکەوتەوە پاش ڕاپەرین هاتەوەو دەستی کردەوە بە خوێندن. ئەو ساتەی بیرکەوتەوە کە لە دوورەوە نەورۆزی بینی، چۆن بەبێ شەرم بەرەو ڕووی ڕایکرد و باوەشی پێداکرد. لەوە تێناگا ئەو هەستە قوڵە هەبوو لە نێوانیاندا کەچی ئەم چاوی خۆی لێداخستبوو، یان نەیدەوێرا ببینێ. هەستی بەماندووبوون کرد. چاوەکانی نوقاند و خەوی لێکەوتەوە.

ئەو ماوەیە هانس و هانس پێکەوە بوون. باوکی زۆر شتی بۆ باس کرد. ئەوەشی بۆ باس کرد کاتێ دایکی ونبوو، ئەم نەیدەزانی هەتاو سکی هەیە. تا ئێستاش نەیزانی بۆ ونبوو. پێکەوە چوونە دەرەوە. زۆر شوێن گەڕان و پێکەوە نانیان خوارد. هانس هەر گوێی لە باوکی دەگرت و هیچ قسەیەکی نەدەکرد. ئەو کاتانەشی کە باوکی پرسیاری لێدەکرد، زۆر بەکورتی وەڵامی دەدایەوە. زۆربەی کات بیری لای دایکی و نەورۆز بوو. باوکی هەوڵی دەدا هێمنی بکاتەوەو دەیگوت نەشتەرگەرییەکەیان سەرکەوتوو بووە. ئەوان هێشتا خەوتوون. جارێ نایەڵن کەس بچێتە ژوورەوە. تەنانەت نەیانهێشت ڕێزان و دەریاش بچنە ژوورەوە. هەر لە شووشەی دەرگاکەوە سەیریان دەکردن. دەریا و ڕێزان لەسەر کورسی بەردەگاکە دانیشتن و دەگریان. ئا لەو کاتەدا هەردوو هانس

هاتنەوە. ڕێزان کە هانسی بینی یەکسەر ناسییەوە. هانس زۆر پیربببوو. قژی هەموو سپی ببوو، هەروەک جاران لەسەرخۆ و جلی کەشخەی لەبەردا بوو. ئەویش کە ڕێزانی بینی، ناسیەوەو بەگەرمی چۆن و چاکیان لەگەڵ یەکتردا کرد وهانس وتی «ڕێزان ئەوە چییە لە جاران جوانتربووی.»

ڕێزان فرمێسکەکانی سڕییەوەو دەستی کرد بە پێکەنین. تەماشایەکی هانسی بچکۆلانەی کرد وتی «ئەم کوڕە جوانە هی کێیە؟». دەریا خێرا لەو لاوە هەڵی دایەو وتی ئەوە کوڕەکەی هەتاوە. ئەی پێم نەوتی کە هەتاو ڕۆیشت سکی هەبوو.»هانس و ئاڤێستا لەم مەسەلەیە نەدەگەیشتن. ئەو کاتەی هەتاو ونبوو، دەریا تەمەنی کەمتر لەیەک ساڵ بوو. ئەی چۆن ئەم نهێنییە دەزانێ. بەڵام کەس کاتی ئەوەی نەبوو لەو مەسەلەیە بکۆڵێتەوە. هانس هەواڵی دایکی و نەورۆزی پرسی. لە شووشەی دەرگاکەوە تەماشای کردن هەردووکیان خەوتبوون. هانس داوای لێی کردن بڕۆنە قاوەخانەکەو لەوێ دانیشن بۆ ئەوەی ئەو ناوە قەرەباڵغ نەکەن. داوای لە پەرستاری ژوورەکە کرد کە خەبەرییان بوویەوە ئاگاداریان بکاتەوە. ئەویش وتی «هەتاو بۆ ماوەیەکی کورت خەبەری بوویەوە، بەڵام نەورۆز هێشتا خەبەری نەبووەتەوە. ئەو زۆر بێهێزە. هەر ئەمرۆش خوێنی تێدەکەین.»هانسی بچووکیش پرسی گەر ئەو دەتوانێ خوێنی خۆیی بداتێ. باوکی سەیرێکی کرد و وتی «کوڕم تۆ هێشتا منداڵی.»دەریاش لەولاوە هەڵی دایەو وتی «منیش دەمەوێ خوێنی خۆمی بدەمێ». ئەوجا گەورەکان کەوتنە خۆیان و ئەوانیش وتیان ئێمە دەمانەوێ خۆێنی خۆمانی بدەینێ. یەکەیەکە گەورەکان چوون تا بزانن خوێنی ئەوان گونجاوە بۆ نەورۆز. ئەو ئێوارەیە هەتاو چەند جارێ خەبەری بوویەوە، بەڵام نەورۆز هەر چاوەکانی نوقاو بوو. لەبەر خۆیەوە بەبێ دەنگی قسەی لەگەڵ نەورۆزدا دەکرد. نەورۆز گوێی

له هەموو قسەکانی بوو لەگەڵ ئەوەی نەیتوانی کاردانەوەی هەبێت. قسەکانی هەتاو ئەو وشانەبوون کە زەمانێک بوو نەورۆز خەوی پێوەوە دەبینی گوێی لێبێت. قسەکانی هەتاو تیشکێ بوو لە خۆشەویستی و ئاسوودەیی. نەورۆز لە دڵێ خۆیدا دەیگوت گەر ئێستا بشمرم بەلامەوە گرنگ نییە. ئەوەی ئێستا گوێم لێیە، تەنیا لە خەیاڵ و خەوەکانم دەکات. هەتاو هێزی دایە بەر خۆی و بە هێواشی هەستایەوەو چوو لە تەنیشت نەورۆزدا وەستا. پەنجە شمشاڵییە بێهێزەکانی خستە ناوقژە پڕ و ماش و برنجییەکەی نەورۆز و دەمی خستە ناو دەمییەوە. ئەو کاتە نەورۆز دەیویست کات بوەوستێنی و دەمی هەر لەناو دەمی هەتاودا بمێنێتەوە. چاوەکانی کردەوە. هەتاو بینی چاوی کردەوەو بزەیەک گرتی وتی «دەزانی پارچەیەک لە جەستەم لەناو جەستەتدایە.». نەورۆز پێکەنی وتی «نەک تەنیا پارچەیەک لە جەستەت بەڵکو هەموو تۆ بەردەوام لە دڵی مندایت.»هەتاو ئەمجارە ماچێکی ناوچەوانی نەورۆزی کرد و وتی «ببوورە دڵم، ببوورە ئازیزم.»کاتێ ئەم ڕستەیەی وت هەستی کرد پێشتر گوێ لەم ڕستەیە بووە، کەی و چۆن، لەیادی نەبوو. ئەمەی هێندە بەلاوە گرنگ نەبوو. بەبێدەنگی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ نیگاکانیان تێکەڵبوون. وشە لەدەمیان نەدەهاتە دەرەوە، بەڵام بە دڵ لەیەکتر دەگەیشتن. پێویستیان بە وشە نەبوو. نەورۆز هەواڵی هانسی پرسی. هەتاو پێی وت ئەو لای باوکییەتی. ئەو خەوەی ئەویش هاتە دی، باوکی ببینێ و لەگەڵیدایە. هەتاو چووە سەر جێگەکەی پاڵکەوتەوەو هەردووکیان ڕوویان لەیەک کردوو بزەیەکی فریشتە ئاسا دەموچاوی هەردووکیانی داپۆشی و هەردووکیان لە ماندووبووندا خەویان لێکەوت.

## سوپاسنامه

سوپاس وا له خوێندەوەی ئەم ڕۆمانە بەردەوامبوون. وابزانم هەریەکە له ئێوه وەک من ژنانی ئەم ڕۆمانەتان خۆش ویست لەگەڵ هەموو لایەنێکیاندا. ئەمانە زۆر بە ڕاستگۆییەوە باسی ئازار و هەست و نەستی خۆیانیان کرد. ئەم ڕاستگۆییە مەحاڵە لە ناو پیاواندا ببینرێ. پیاوەکانمان وەک قوتوویەکی داخراو وان، تەنانەت بۆ خۆشیان سەری قووتووەکە ناکەنەوە. من خۆم زۆر هەوڵمداوه یارمەتی ئەو پیاوانە بدەم کە بوونیان هەبووە لە ژیانمدا تا خۆیان وەک گوڵی بەهارە بکەنەوە. لە زۆربەی هەوڵەکانمدا سەرنەکەوتم. زۆر جار دەڵێم ئەمە هەڵەی ئەوان نییە، بەڵکو هەڵەی پەروەردەی کۆمەڵگایە. کوڕەکانمان نابێت بگرین و هەستەکانیان دەرببڕن، نابێت هەست بە ئازار بکەن و نابێت داوای باوەشی دایک بکەن. ئەوان وەک کچەکانی خێزان ناتوانن کە دڵیان خۆش بوو پێبکەنن و کە خەمگین بوون بگرین. ئێمەی دایک دەبێت لەمەودوا بەهەمان پێوەرە لەگەڵ کچ و کوڕەکانماندا مامەڵە بکەین. براکانمان فێری کراوەیی بکەین، مێردەکانمان فێری بەکارهێنانی وشە بکەین. هەرچەندە سروشت لەگەڵ ئێمەی ژندا زۆر نادادپەروەرە. لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕانی ئەم جیهانەی بە ئێمە سپاردووە. ئێمەی ژن

دەبێت بە ئاگا و ئازا بین جڵەوی ئەو گۆڕانکارییە بگرینە دەست و ژیان بەرەو ئەو ساتە بەرین کە ئازارەکانی تێدا کەم دەبێتەوەو پارە و سامان سنوور بۆ بەهاکانی مرۆڤایەتی دانەنێن.

لێتان ناشارمەوە زۆربەی بەشەکانی ئەم ڕۆمانەم لە دوورگەیەکی وڵاتی یۆناندا نووسیووە. ڕۆژێک بەلای پەیکەری خواوەندی خۆشەویستی ئەفرۆدیتەی کچی زیۆوس تێپەڕیم. لەبەردەم پەیکەرەکەدا وەستام و بیرم کردەوە، دەبێت نهێنی خۆشەویستی چی بێت لە ژیانماندا ئاوا میهرەبانی و ئارامیمان بێ هیچ مەرجێ پێدەبەخشێ.

ئەو ساتانەی وا نیگاکانم دەبڕییە شەپۆلەکانی دەریا، بیرم لە دەریا دەکردەوە. ئێمە بەشێکین لە دەریا. دەریا لەسەدا هەفتای زەمین دادەپۆشێ. جەستەی ئێمەش لە سەدا هەفتای شلەمەنییە. دەریا دەتوانێ فێنکی و ئارامیت پێببەخشێ. لەهەمان کاتدا دەتوانێ هەناسەکانت لێ زەوت بکات. ئێمەش دەتوانین جەستەی خۆمان بکەینە پەرستگایەکی هێمنی پڕخۆشەویستی. دڵمان بکەینە سەرچاوەی بەختەوەری خۆمان و خەڵکانی دەوروبەرمان. گەر دڵمان بووە سەنتەری ژیانمان. ئەوا نیگاکانی چاومان و وشەکانی زمانمان لە خۆشەویستی و ئاسوودەیی زیاتر هیچ دەرنابڕێ. دەشتوانین دڵمان بکەینە سەرچاوەی ڕق و کینە، لە ئازاردانی خۆمان و خەڵکی ترو هیچ لە ژیاندا شک نەبەین. بیرمکردەوە دەبێت ئێمەی دایک چی بکەین. منداڵەکانمان هەر کە لە دایکدەبن دەبێت فێریان بکەین دڵیان لە کوێدایەو گوێ لە ترپەی دڵیان بگرن. ئەو کاتە ئەوان وەک ئێمە دەرناچن. ئەوان وەک بوونەوەرێکی خاوەن دڵ دەردەچن و بڕوایان بە دڵیان دەبێت. ڕێگەی گەیشتن بەدڵ دەدۆزنەوە. هەموو ئەو ڕووداوانەی بەسەر ژنانی ئەم ڕۆمانەدا

هاتن، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی نە ئەوان و نە ئەوانەی لەدەوروبەریان بوون نەیانوێرا گوێ بۆ دڵی خۆیان بگرن. تکایە ئێوەش شەرم لە گوێگرتنی گۆرانیەکان و سیمفۆنیای دڵ مەکەن. بڕوا بکەن ئێوەش وەک من هەست بەخۆشەویستی هەموو شتێکی دەوروبەرتان دەکەن. ئەو خۆشەویستیەش دەبێتە سەرچاوەی ئازادی و ئارامی دەروون، دەبێتە سەرچاوەی سەرکەوتن بەرەو هەتاو. ببوورن مەبەستم هەتاوی ڕۆمانەکەم نییە. بەڵکو خۆرە. بیرمچوو بۆتان باسبکەم، هەتاو لەگەڵ نەورۆزدا و لە شاری ستۆکهۆڵم ژیانێکی نوێی پڕخۆشەویستیان دەست پێ کرد. هانسیش هەفتە ناهەفتەیەک دەچووە لای باوکی. دەریا و هانس بوونە دوو هاورێی گیانی بەگیانی. هەتاو و ڕێزان و ئاڤێستا بوونە سێکوچکەیەک. ساراش هەموو هەفتەیەک چەپکێ گوڵی دەنارد بۆ هەتاو و لە کارتێکی بچووکدا دەینووسی»سوپاس» هەر خۆی و هەتاو ئەو نهێنییەیان دەزانی.

دوو فرمێسک وەک هێمنی شەپۆلە نەرمەکانی دەریاکەی بەردەمم بە گۆنامدا هاتنە خوارەوە. ئەو ڕۆمانەی کە بۆ ئێوەم نووسی کۆتایی پێهات و دەرگایەکی ترم بەرەو پەرستگای خواوەندی خۆشەویستی کردەوە. ڕۆمانەکەم لە ئامێزگرت و بە کەناری دەریاکەدا ڕۆیشتم. بینیم چۆن شەپۆلەکان لەسەر ئاوازی گۆرانی گوڵی زەردو سووری عەباسی کەمەندی بەبێ شەرم و بەنازەوە سەما دەکەن. منیش هەنگاوەکانم خێراکردەوەو ڕووم لە ڕۆژئاواکرد و خۆم لە تیشکی پەمەیی خۆر ئاڵاند.

رۆمان

# لە ئامێزم بگرە

ڕێواس ئەحمەد



ئەو ئێوارەیەی ڕووناکییەک وەک پەردەیەکی پەمەیی هەموو جەستەمی داپۆشی
ئەو ئێوارەیەی دەموچاوێکی زبر خۆی خزاندە ئامێزی گۆنا شەرماوییەکەم
ئەو ئێوارەیەی لێوێکی تینوو هەموو جەستەمی خواردەوە.
ئەو ئێوارەیەی چاوێکی لەناو خەمدا خنکاو، بوو بە بەرگی بووکێنم.
ئەو ئێوارەیە بڕیارمدا کە هەردەم گوڵی هەتاوی سەما بم.
ئەو ئێوارەیە بڕیارمدا لەمە زیاتر خۆم نەخزێنمە سوچی زیندانی دڵیکی بێ ترپە
لەو ئێوارەوە من خەندەم و باڵەکانم بەرەو ئاسمانی چاوە نوقاوەکانی بودام دەبا.

چاپخانەی رۆشنبیری

٢٠٠٠ دینار